## ماریيا ڤینە



# شێرێکیان کوشتووە!

وەرگێڕانی: خەبات عارف

Bokförlaget Aura

# شێرێکیان کوشتووە!

نووسینی: مارییا ڤینە
وەرگێڕانی: خەبات عارف

Bokförlaget Aura
2010

شێرێکیان کوشتووە!
نووسینی: مارییا ڤینە
وەرگێڕانی: خەبات عارف
چاپی یەکەم: سوید، ستۆکهۆڵم ٢٠٠٤
چاپی دووەم: کوردستان، هەولێر ٢٠٠٧
دەستگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
چاپی سێیەم، ئینتەرنێت: سوید، ستۆکهۆڵم ٢٠١٠
Man har skjutit ett lejon?
Översättning: Khabat Aref Marouf
Första utgåva - Stockholm 2004
Andra utgåva - Kurdistan - Hewler 2007
Tredje utgåva - OnLine - 2010
Bokförlaget Aura
Västertorpsvägen 142
129 44 Hägersten
www.aura-publishit.com
E-mail: info@aura-publishit.com
khabat.aref@comhem.se

# پێشەکیی
## چاپی سێیەمی "شێرێکیان کوشتووە" ١٩٧٤

ئێستا کە بۆ جاریی سێیەم چیرۆکی بەسەرهاتەکانم بڵاو دەکرێتەوە، حەز دەکەم و دەمەوێت چەند وشەیەک لە بارەیەوە بڵێم.

سەردێڕی "شێرێکیان کوشتووە"م بۆیە هەڵبژارد، چونکە شێر، بۆ من، نوێنەرایەتیی هێز دەکات و ئەگەر منداڵیی منیش هێندە پڕ لە ترس و تۆقاندن و دوور لە خۆشەویستی نەبووایە، دڵنیام کە دەبووم بە کەسێکی بەهێزتر و دڵنیاییەکی زیاتریش ناخ و دەروونی پڕ دەکردمەوە. کەواتە ئەو شێرە کوژراوە، منم.

هاوکاتیش بەئاگام لەوەی کە هەندێک لە بەسەرهاتە ترسناکەکانم زێدەڕۆییان پێوە دیارە، بەڵام ئەو بەسەرهاتانە لە چاوی منداڵێکەوە بینراون و بە دڵنیاییەوە ترسوبیمیش ڕۆڵێکی زۆر گەورەتریان لە دنیای منداڵێکدا هەیە، زۆر زیاتر لەوەی لە شێوەیەکی ئاساییدا دەیهێنیتە پێش چاوی خۆت.

وا پێدەچێت، بیرەوەریی ئەو بەسەرهاتانەی سەردەمی منداڵی، تا ئێستاش، بۆ من گرنگی و بایەخێکی زۆریان هەبێت. من سەرەڕای شیکاری و لەخۆکۆڵینەوە و هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی چارەسەر ــ کە دەتوانرێت "کتێبی شێرەکە!" بە هەوڵێک بەرەو گەیشتن بەو ئامانجانە دابنرێت ــ نەمتوانیوە خۆم لە دەست مۆتەکەی ئەو بەسەرهاتانە ڕزگار بکەم.

نیگەرانی و نادڵناییم بەرانبەر بە سەگ، بە پێچەوانەوە،

زیادی کردووە، بە هەمان شێوەش گومان و دوودڵیم بەرانبەر بەو مەسعەدانەی پێیان ئاشنا نیم و تا ئێستاش لە ئاست پشیلەدا هەست بە نادڵنیایی و گرژی و لەشبەباری دەکەم.

ئەو ڕووداوە بێبایەخەی، ئەگەر لە دەرەوەڕا تەماشای بکەیت، بەرانبەر بەو پاکەتانەی کە لە جەژنی کریسمسدا وەریاننەگریت، جێیەکی وا قووڵی لە ناخمدا بە جێ هێشتووە، کە لەگەڵ هاتن و نزیکبوونەوەی هەر جەژنێکی کریسمسدا، هەست بە بۆشاییەکی پڕ لە نیگەرانی و خەمینی دەکەم. بەڵام لەوە دەچێت کە بە تەواوی بەسەر ترسان لە ئاوە قووڵەکاندا زاڵ بووبم: من ئێستا بوومەتە مەلەوانێکی چاک و لە مەلەکردندا باوەڕم بە توانای خۆم هەیە.

بێگومان لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژگاردا خۆم فێر کردووە کە چاکتر هەڵسوکەوت لەگەڵ یادەکانی سەردەمی منداڵیمدا بکەم و بەرەو ڕاڕەوە بەرهەمهێنەرەکان بە کێشیان بکەم. هەروەها هەندێک لەو بەسەرهاتانەش قاڵتریان کردووم لە ژیاندا و سەرمایەیەکی زیاتریان بۆ کارکردن لەگەڵیاندا خستووەتە بەر دەستم. پێم وایە، ئەو جۆرە توانایەش کە بتوانم بچمە چارەنووسی مرۆڤەکانی ترەوە و تێیاندا بژیم، یەکێک لە دەرئەنجامە چاکەکانی سەردەمی منداڵیمە.

ئەگەرچی ترس و نادڵنیایی بەسەر کتێبەکەمدا زاڵن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بڕگانەشی تێدا هەن کە ساتەکانی بەختەوەری و دڵشادی دەگێڕنەوە. دەکرێت هەر ئەو ساتە کورتانەش بن کە وایان کردبێت ترس و خەمینی قووڵتر هەستیان پێ بکرێت، یان تۆ بڵێیت، سەرباری هەر شتێکیش، هەر ئەو ساتە کورتانە نەبن کە منیان تا ئێرە گەیاندووە؟

کەمێک لەوە دوودڵ بووم کە بەشی یەکەمی کتێبەکە لاببەم

یان نا. ئەو بەشە نەختێک ڕەنگوڕووی ئەفسانەی پێوە دیارە، بەڵام لە دووبارە خوێندنەوەیدا ئەوە دەبینمەوە کە ئەو بەشەش باسوخواسێکی بۆ گێڕانەوە تێدایە. ئێستا لێم ڕوونە، کە ئەوسا پێویست بوو کە بۆ هەڵکوتانە سەر یادەکانی سەردەمی منداڵیم، پەنا بۆ گێڕانەوەیەکی ئەفسانەیی بەرم، تا تۆزێک کەمتر هەست بە ئێش و ئازاریان بکەم.

ئێستا یەک دوو ڕووداوی نوێم بۆ کتێبەکە زیاد کردووە و ئەوانەش سووک و ئاسان لەگەڵ دیسان خوێندنەوەی کتێبەکەدا لێم دەرکەوتن، بێجگە لەوەش چەند برگەیەکم لە کتێبەکانی ترمەوە، کە پێم وابوو، ئێرە جێیان بێت، وەرگرتووە و هەندێک برگەی تریشم سەرلەنوێ داڕشتووەتەوە.

سۆڵنا

١٩٧٤/٢/؟؟

ماریا ڤینە

***کە بەتاسەوە*** دوای یادەکانی منداڵیم کەوتم، هەڕەشەیان لێکردم، سەروچاوە تووڕە و تۆسنەکانی خۆیان لێ وەرگێڕام، پەلاماریان دام و، فڕێیان دامە تاریکییەکەوە، لەوێ، بە کلیلی ئاسنینی قورس لێیان دام. کاتێک، دەم بە هاوار، سەرم نایە نێو دەستەکانمەوە، مرۆڤەکان بەگیریان هێنام و لەنێو قەفەزی شێرێکدا، بەندیان کردم.

لەبەر شیشبەندی قەفەزەکەدا، دەستم کرد بە قسەکردن لەگەڵ خۆمدا: لەڕاستیدا من مرۆڤێکم و دەبێت وەک مرۆڤ بژیم و بیر بکەمەوە، بەڵام هەرچییەک لە دنیای شێراندا ڕوو دەدات، بەتوندی، پێوەندی بە منەوە هەیە، پیاو ناتوانێت شێرێک بکوژێت، بێ ئەوەی لەنێو خۆمدا، هەست بە مەرگ و ئازارەکانی نەکەم. ناخۆشترین هەستیش ئەو هەستەیە، کاتێک دەمەوێت پێبکەنم، پێکەنینێکی مرۆڤانە و، دەنگی گوللەیەک دێتە بەر گوێم و شێرێکی پێکراو دەبینم. ئەوکات خۆم لە دنیای مرۆڤەکان دەکێشمەوە و، بۆ ماوەیەکی درێژخایەن، بەنێو جەنگەڵی خەونەکانمدا ڕۆ دەچم.

ڕۆژانە قەفەزەکەم تەنگە، زۆربەی کات، سەرم بەر شیشەکانی دەکەوێت، بە جۆرێک کە ئاگرەکان بە ئاگا دێن و پەلامارم دەدەن، دەمسووتێنن و منیش بەدەم ئازارەوە دەقیژێنم. لەنێو شیشەکانەوە دەست دەبینم بۆ یارمەتیدان درێژ دەکرێن، بەڵام کاتم نییە چاک ببمەوە، بیر لە سەرهەڵگرتنی خۆم دەکەمەوە، بەردەوام بەرەو شیشبەندەکە ڕادەکەم و ڕێ بە خۆم دەدەم ئازار بچێژم، یان لە جێی خۆمدا دەمێنمەوە و گوێ بۆ دەنگی گوللەکان ڕادەگرم و شێرەکانیش دەبینم دەگلێن و بە لادا دێن.

شەوانە، قەفەزەکەم، چیتر قەفەز نییە. بە هەمان هێز و

بوێریی شێرەکەوە، بەنێو جەنگەڵی خەونەکانمدا، دەگەڕێم. جارنا، لە دوورەوە، دەنگی مرۆڤان دەبیستم و؛ جارجاریش لەنزیکەوە، دەنگی گیانلەبەران دێتە بەر گوێم، دەبینم مرۆڤەکان خۆیان دەگۆڕن و دەبن بە گیانلەبەر و گیانلەبەرەکانیش بە مرۆڤ. دەوەنە بچووکەکان دەبینم بە ئاگری باڵندە ڕەنگاوڕەنگەکانەوە دەگڕێن، ڕووباری ئاسمان دەبینم کە سێبەری لق و پۆپەکان بەند دەکات. قیژەی بکوژ و کوژراوەکان دەبیستم. زریانەکان دەبیستم گەورە دەبن و دەبن بە ئۆرکان، ئۆرکانەکانیش دەبینم گوڵە گەورە لمینەکانی بیابان لە بنارەوە بەرەو دوندی چیاکە هەڵدەگرن، دەنگی بەئاگاهێنەرەوەی هەورەتریشقە و گولله دەبیستم، برووسکە دەبینم مارە ئاگرینەکانی لە تاریکیی درەختەکان دەچەقێنێت و گیانلەبەرانیش هەڵدێن، پۆلێک باڵندە دەبینم، بە بەرزایی ئاسمانەوە، فوو بە شمشاڵە دەنگنووساوەکانیاندا دەکەن. دەبینم، بریسکوهوڕی دەریا بەر شەوارەیان دەخات و بەر دەبنەوە و، وا هەست دەکەم کە دەبێت منیش بەرەو دەریاکە ببمەوە، بەڵام چەند زیاتر، بەرەو دەریاکە ڕا بکەم، هێندە زیاتر خۆی دوور دەخاتەوە و لێم هەڵدێت.

شەوێک لەو شەوانە ڕووبەڕووی ماری جەنگەڵ بوومەوە. ئێمە، هەمیشە خۆ لە یەکتر لا دەدەین، بەڵام ئەمشەو بە فیشکەفیشک لێم ڕاست بووەوە و پەلاماری دام، بە جۆرێک کە ناچار بووم بیکوژم. ئەمە کاتێکی زۆری خایاند و، کاتێکیش بە مردووی لە بەردەمی خۆمدا بینیمەوە، زۆر خەمبار بووم و ئارەزووی چوونە سەر دەریاشم لە دەست دابوو. بەڵام لەپڕێکدا دەریام لە پێش خۆمدا بینی، بەچکەشێرێکیشم بینی لە کەناری دەریا نزیک بووەوە، لە

پشت دەوەنێکیشەوە ڕاوکەرێکم، بە تاپڕێکەوە، بینی و بەرەو پێشەوە ڕامکرد و بۆ ئەوەی شێرەکە ئاگادار بکەمەوە بەو نێوەدا قیژاندم. بەڵام درەنگ بوو! دوای گوللەکە، بینیم شێرەکە بە لادا هات و، کاتێکیش گەیشتمە سەری، کچێکی دەمولێو خوێناوی لەوێ کەوتبوو. هەڵمگرتەوە، خستمە سەر پشتم و، بەنێو دارستانەکەدا بردم.

بۆ سبەی، کە لەنێو قەفەزەکەمدا بە ئاگا هاتمەوە، تەواو دڵنیابووم لەوەی کە نابێت مرۆڤەکان بمکوژن. ئەوانیش هەر هەمان بەیانی دەرگای قەفەزەکەمیان کردەوە و لە دەرەوەش دارستانی منداڵیم تەواو ڕووناک بووبووەوە و، گشت هەورازەکانی خۆی لە بەردەممدا ڕاخستبوو.

*"Fredrik d. 7 skænkede Jægerspris Slot til Grevinde Danner, der oprettede Kong Fredrik d. 7.s Stiftelse hjælpløse og forladte Pigebørn af Almuen."*

***لەپڕێکدا***، دەورەدراو بە کـــۆمـــەڵێک کچ، کـــە چاوە شـــینە گەورەکانیان تێ بڕیبووم و لە هەموو شتێک ورد دەبوونەوە، لە پشت دەروازەی خـــانـەی منداڵاندا خـــۆم بینیـیـــەوە، ژنێکی نـەناســـیـــاویش هاتـە ژوورەوە و وتـی: بـە (خـــوشـک) بانگـی دەکەین، چونکە تەمەنی تەنیا دوو ساڵانە و لـە هەمووشتـان بچووکترە. پەنجەگەورەمی لە دەمم دەرهێنا و ئەو کەسەش کە لەگەڵ خۆیدا بردبوومیە ئەوێ، دەستی بەردام و بۆ هەمیشە لە دەروازەکـەوە ون بوو، گەورەکچێک لێم هاتـە پێش و بەرەو ژوورێکی تری بردم. لەوێ، هێندەی نـەمـــابوو، لە گـێـــژەنی دەنگی ئەو منداڵانەدا کە پێدەکەنین، بخنکێم.

لنگە پۆڵایینە پڕشنگدارەکانی مـقـەسـتـەکـە لە هەوادا کـەوتبـوونـە لنگەفـرتـێ و هێندە گـەورە و خـۆنـەگـر بوون، کـە ناچار بووم هەردوو دەستم، کـاتێک کـە دەمویست کـاغـەزە ڕەش و زەرد و سـوورەکـانی پێ ببڕم، بە کـار بهێنم. یەک لە دوای یەک، بە مـقـەستـەکە، شێوەی دڵم لە کاغـەزە ڕەشـەکـان دەردەهێنا، تاکو دواییەکەی بە لۆمە و سەرزەنشتەوە گشتیان لەتوپەت کـردن و وتـیـان دڵ دەبێت سـوور بێت. پاشـــان دڵی سوورم دەرکرد، یەک لەوی دیکەیان گەورەتر و کچەکانیش لە دەوروبەرم دانیـشـتـبـوون و هەر دەمـانـبـڕی و دەمـانـبـڕی و مـقـەسـتـەکـانیـشـمـان وەکـوو مـاسی فرتەفرتیان دەکـرد و دەبریسکانەوە، بەڵام هەر ئەوسا یەکەوڕاست مقەستەکەم بە لنگی کـــراوەوە لە هەوادا وەســـتـــا و هەمـــوو لەشم کـــەوتە

لەرەولەرز: سێبەرئاسا و بە خێرایی بەرپرسیارەکەمان بەسەر پشتی ئەسپە ڕەشەکەیەوە بەبەر پەنجەرەکەدا ڕەت بوو. سەگەلێکی چڵێسیش بە هەناسەبڕکێوە بە دوای کەوتبوون، لمۆزە کراوە و داچەقاوەکانیان وەکوو ئەشکەوتی سوور دەبریسکانەوە و لەنێویاندا زمانە تەڕ و لیکاوییەکانیان شۆڕ بووبوونەوە و لە دڵە کاغەزییەکانی من سوورتر بوون. هاوکات یەکێک لە سەگەکان خۆی بۆ پەنجەرە کراوەکە هەڵدا و ژوورەکەی پڕ کرد لە گرموهوڕی وەڕین.

هەموو دڵە لە کاغەز دروستکراوەکانم لە دەست بەر بوونەوە و تۆقیو و دڵ پڕ لە خورپە بەرەو کوانووە ئاسنینەکەی قوژبنی ئەوسەری ژوورەکە، کە مینا پشکۆ دەگڕا، هەڵهاتم.

دەبوو سالانە، دوو جاران، گوڵ لەسەر گڵکۆی ژنی خاوەنزەویزارەکانی ئەو دەوروبەرە کە وەکوو پارێزەرمان لەو نزیکەوە نێژرابوو دابنێین. ئەو دووسەد ساڵ بوو مردبوو و بە سەدان کچیش سالانە، دوو جاران، گوڵیان لەسەر گڵکۆکەی دانابوو: گوڵەکانی پاییز کە سوور و پڕ لە ژیان بوون و گوڵە بەهارییەکانیش کە زەرد و خەمبار دەهاتنە پێش چاوان.

دەیانگێڕایەوە کە ئەو ژنە دۆستی پادشایەک بووە. دۆستی کەسێک بوون؟! دەبێت کەسێکی زۆر خۆشەویست بووبێت و منیش، کاتێک بێدەنگ و لەسەرەخۆ لەو پلیکانانەوە کە سێ هەنگاو لەو شیشبەندەوە دوور بوون کە دەوری گڵکۆکەیان دابوو دەهاتمە خوارێ، پەیمانم بە خۆم دا کە دەبێت منیش ببمە ژنێکی وەک ئەو و کە گەورەش بووم، ببم بە دۆستی کەسێک. دەبێت زۆر لەبەر دڵانیش شیرین بم!

بۆ ئەوەی بتوانم گوڵەکان بەسەر ئەو شیشبەندەدا کە دەوری گڵکۆکەیان دابوو هەڵدەمە سەر گڵکۆکەی، دەبوو

لەسەر نووکی پەنجان بوەستم. بێدەنگ لەو پەیکەرەم دەڕوانی کە وێنای ئەوی دەنواند: چاوەکانی کوێر بوون.
بەڵام، کاتێک بە هێواشی بەنێو دەریایەک لە گەڵای سووری ئاگرین و وەریوی پاییزدا بەرەو ماڵەوە ـ بەرەو خانەی منداڵانەکە ـ دەبوومەوە، دڵی خۆم بەوە دەدایەوە، کە هەر چۆنێک بێت زۆر لەبەر دڵان شیرین بووە و خۆشیان ویستووە.
سبەینێ دەچین. من پێشووتر سۆزم بە کچەکان دابوو کە لەگەڵیاندا بچم بۆ ئەو ژوورەی مردووەکانی لێ بوو. دەیانوت ئێسکی مردووەکان هێشتا لەوێ، لە ژوورەوە، ماون و ئەگەر جامولکەیەک خواردن لەوێدا دابنێیت، بۆ سبەینێ هیچی تێدا نامێنێت.
پەشیمان بووم لەوەی سۆزم پێدابوون و بیرم لەوە کردەوە چۆن خۆ لەو پەیمانەم ڕزگار بکەم. ئەگەر نەخۆش بکەوتمایەوە، بێگومان دەمتوانی لەنێو جێگادا بمێنمەوە و لەگەڵیان نەچم. سەرم بە قەراغی جێگاکەدا کێشا، پەنجەم لە قوڕگم وەردا، لێفەکەم لەسەر خۆم فڕێ دا و لە جێی خۆم خەریکی بۆڵە و خورتەخورت بووم و چاوەڕێ بووم نەخۆشی بێت و لە جێگادا بمهێڵێتەوە. ئێستا ئیتر پێم وابوو کە قوڕگم دەئێشێت و لە ڕاستیشدا کاتێک قوتم دەدا نەختێک دەئێشا و ئارخەیان لێی نووستم. بۆ سبەی بە زەردەخەنەیەکی تاساوەوە سەرم بۆ گەورەکان هەڵبڕی و وتم نەخۆشم. بەڵام کەسیان باوەڕیان پێ نەکردم و ناچار بووم هەڵسم و بکەومە دوایان.
کاتێک بەرەو ئەو ژوورە تاریکونووتەنەکەی مردووەکانی لێ دانرابوو ڕۆ چووین، دەستی یەکتریمان گرتبوو. بۆنی کەڕووی لێ دەهات و بنمیچەکەش ئاوی ساردی لێ

دەتکایەوە. هەوای سارد، وەک پارچەپەڕۆی تەڕکراو، لە قاچوقوڵمان دەپێچرا. من لەبەر ئەوەی بچووکتریانیان بووم لە ڕیزەکەدا لە دوای هەموویانەوە بووم. پشت و ئەو دەستەم کە بە دەستی کەسەوە نەبوو، لەو تاریکاییە دەترسان کە تا دەهات زیاتر لە دوامەوە زیادی دەکرد. چەند قووڵتر ڕۆ دەچووین، هێندە زیاتر دەبوو خۆ بچەمێنینەوە. کەس نەیدەوێرا هیچ بڵێت. تەنیا گوێمان لە دەنگی مردووی ئەو دڵۆپانە بوو کە دەکەوتنە سەر ئەرزە بەردینەکە. دەستە تەنیاکەمم، ئەو دەستەی کە بە دەستی کەسەوە نەبوو، لە بنباڵمدا شاردەوە. تا دەهات پەنجە تێکەڵوپێکەڵەکانمان، قووڵتر و قووڵتر، ترس و بیمی خۆیان بەنێو لەپی دەستەکاندا ڕۆ دەکرد و ترسی هاوبەشیشمان تەواوی ژوورەکەی پڕ کردبوو لەو قیژە و هاوارانەی کە هێشتا لە دەم نەهاتبوونە دەر. هێواشتر و نادڵنیاتر بەرەو پێش ڕۆ چووین و وا پێدەچوو کە ڕاڕەوەکە بێ کۆتایی بێت. لە هەردوولاوە تاریکایی دەوری تەنیبووین. بەڵام هەر لەو کاتەدا بێدەنگییەکە، بەو قیژەیەی کە چاوەڕوان دەکرا، شکێنرا. یەکێک لە کچەکان پێی هەڵنووتا و بە قیژەقیژەوە دەستی هاوڕێیەکەی بەردا و ڕایکردە دەرەوە.

هەر دوای ئەوە گەردەلوولێکی تۆقێنەر لەنێو ئەشکەوتەدا هەڵیکرد و هەموو دەستی یەکتریان بەردا و بە قیژوهوڕ بە بەردەمی مندا بەرەو دەرەوە ڕایانکرد. نەمویرا لە جێی خۆم بجووڵێم و نەشمدەزانی دەرییەکە دەکەوێتە چ لایەک و هەر بینیت و، ئێستا نا دەمێکی تر، تەنیا و بێکەس لەگەڵ قیژەکانی خۆمدا بە جێ هێڵرام. دەمویست خۆم لەسەر ئەرزە بەردینەکە پاڵ بخەم، بەڵام لەو کاتەدا هەستم بە چنگێک کرد

کرا بە قوڵمدا. یەکێک لەگەڵ خۆیدا بۆ دەرەوە پەلکێشی کردم.

لە دەرەوە خـۆری زسـتـان، کـز و لاواز، دەدرەوشـایەوە و کچـانیش بە قـریشکەقـریشک و بە کـامی دڵ لەگەڵ کـوڕانی گوندەکەدا بە لاپاڵی ئەو گردەوە کـە نزیک بە گۆڕسـتـانـەکە بوو، پێکـەوە، خـەریکی خلیـسکێن بوون. ئەوەی کـە منی ڕاکـێـشـابووە دەرەوە یەکـێک لەو کـوڕانە بوو و پاشـان لێی پرسـیم ئـاخـۆ دەمـەوێت خلیـسکێنەی لەگـەڵ بکەم، منیش لارەمل بـە سـەر وەڵامم دایـەوە و پـێکـەوە کـەوتیـنـە خـۆخلیـسکاندن، بەڵام کـە بینی من وەکوو کـچـەکانی تر لە خـۆشـیـاندا ناقـریشکێنم و لەوێدا کـز و لاواز و تەزیو دوای کـەوتووم، هەر زوو تـاقـەتی لێم چوو و منیش بەدەم بۆڵە و خورتەخورتەوە بەرەو ماڵ گەڕامەوە.

***هەر لەبەر ئەوەی*** بەیانییەکەی هێندەی دڵ بخوازێت قەشەنگ و جوان بوو و منیش نەمدەزانی چی لەو خەنین و شادییە بکەم کە لەشی داگرتبووم، سێوێکی قەدەغەکراوم هەڵگرت و دانم لە گووپە سوورەکانی گیر کرد. لە سزای ئەوەدا، بەو ڕۆژی ڕووناکە، ناچاریان کردم بڕۆم و بخزێمە نێو جێگا و بنووم.

کاتێک کە لە گریەگری بوومەوە، چاوم بە هەموو لایەکی ئەو هۆڵی نووستنە چۆڵوهۆڵەدا گێڕا. هەموو شتێک تا ڕادەی تۆقاندن سپی بوو. پەنجەرە نیوەکراوە هاوینییەکان بە چاوە کوێرەکانیانەوە تێیان دەڕوانیم، با لە شووشەکانیانی دەدا و ترسی دەچۆڕاندە نێو گوێیەکانمەوە، باسکی شەکاوەی پەردەکان هەڕەشەی پەلاماریان لێ دەکردم، کۆڵەکە سپی و تۆکمەوتۆڵەکانی بنمیچەکەش هێزی خۆیان پێشان دەدام و خۆیان لە بەرانبەر بێهێزیی مندا دەنواند. هەتا نەمدەوێرا سەیری ژێر جێگای نووستنەکەم بکەم و لەوەش زیاتر نەمدەوێرا دەستەکانم بەسەر چەرچەفەکەمەوە بهێڵمەوە، نەکا خێوێک پەلاماریان بدات. زۆر شت بوون کە چاوەکانم دەبوو پاسیان بکات: پەنجەرەکان، دەرگاکان، جێگای نووستنەکەم، کۆڵەکەکان، پەردە دادراوەکان. نەموێرا سەیری پەنجەرەکەی پشتمەوەم بکەم، نەموێرا ئاوڕ بدەمەوە، نەکا پەردەکانی پەنجەرەکەی دی هەڵکوتنە سەرم، بەڵام گوێم ڕادێرابوو، چرووپڕ بە گوێی پشتسەرم گوێم ڕاگرتبوو و هەر ئەوساش گوێم لە هەنگاو دەبوو خۆیان لە پشتم کە ترس خۆی لێوە پێچابوو نزیک دەخستەوە، بینیم چۆن دەسکی دەرگای ئەو ژوورەی کە جلوبەرگی تێدا هەڵدەگیرێت دەستی بە جووڵەجووڵ کرد، چۆن کۆڵەکەکان خۆیان لار دەکردەوە،

خـۆیـان لوول دەدا و بە هەڕەشـەوە بەسـەرمـدا دەچەمـانەوە. کاتێک کە دەسـتـەکانمم بەرز کردەوە بۆ ئەوەی خـۆمـیان لێ بپارێزم، کتوپڕ هەنگاوەکان لە پشتەوە وەستان و دەرگای ئەو ژوورەش کە جلوبەرگی تێدا هەڵدەگـیرێت بەتوندی بـە یەکدا هات و زرمــەی لێــوە هـەڵسـا. دەمـوچاوم خـسـتـە ژێر سەرچەفەکەمەوە و قیژاندم. شتێکی سارد بەنێو لەشمدا کەوتە جووڵەجووڵ.

کە گەورەکـان بەپەلە و هەڵەداوان گـەیشـتنە سـەرم و بە تەنیا لە هۆڵی نووستنەکـەدا بینیـانمەوە، هەر ئەوەندەیان پێکرا سەرێکیان لێ بادام و لێـیان پرسیم کـە بۆ گـشت جلوبەرگی ژوورەکـەم بەسـەر یەکـتـردا داوە. منیش هەر ئەوەندەم لە دەست هات بەوە وەڵامـیـان بدەمـەوە کـە من هەرگیز سەرم بەو ژوورەدا نەکردووە.

سەرەتا پـەنجەگەورەمیان لەنێو ئەشکەوتی دڵنیا و گەرمی دەممدا دەرهێنا و دەموچاوە زل و قەبەکانی خۆیان بەسەردا چەمـاندمـەوە، لچیـان لێ هەڵقوورچاندم و وتیان: عـەیبـە... عـەیبـە، نابێت پەنجـەت بمژیت! پاشـان، کـاتێک پەنجـە خەونبینەرەکانم لەنێو کونەلووتەکانمدا دەگەڕان، بەنەرمییەوە بە دەستەکانیاندا کێشام و، بە توندوتیژییەوە وتیان: ئای، ئای، کـچی گـەورە نابێت دەست بە کـونـەلووتیـدا بکات! کاتێکیش کە مرواریی نێو ڕانەکانمم دۆزیەوە و دەمویست بە دەستەکانم شەوقی پێ هەڵبهێنم، توندتر بە دەستەکانیاندا کێشام. بەڵام ئەمجارەیان، لە چەند نیگایەکی بەد و ناحەز زیاتر، هیچیان بۆ باس نەکردم. لەو کاتەوە ئیتر شاردنەوەی دەستەکان لەژێر گەرمیی لێفەدا، گەڕان بەنێو نهێنییەکانی جەسـتـەدا و دۆزینەوەیان قـەدەغـە بوو. هـەمـوو شـەوێک چاودێریی ئەوەیان دەکرد، دەستەکان بەسەر لێفەوە بن، کە لەوێدا وەک باڵندەی تەزیووی بێ هێلانە خەویان لێ دەکەوت.

***گرەومان*** لەسەر ئەوە کرد کێ نامەکە بۆ بەرپرسیارەکەی خانەی منداڵان بە جێ بهێڵێت. تا خوا حەز بکات، لە سەگە چڵێسەکانی، کە هەمیشە بەر لەوەش بگەینە بەر دەرگاکەی هەستیان بە نزیکبوونەوە و گەیشتنی ئێمە دەکرد، دەترساین.

من دۆڕاندم و بەدەم زەردەخەنەوە کاغەزەکەم وەرگرت و بە ڕێ کەوتم. لەڕاستیدا ژوورەکەی ئەو کەوتبووە ئەوبەری باخچەکەوە و ڕاستەڕێگایەکمان بەین بوو، بەڵام من ئەوەم پێ باشتر بوو لاڕێیەک بگرمە بەر. بە وریاییەوە بە پاڵ دیواری خانووەکەدا خۆم دزییەوە، تا سەگەکان چاویان پێم نەکەوێت کە هەمیشە لەبەر پەنجەرەکەیدا دەوەستان و شووشەکەیان بە لیک دادەپۆشی.

بێ ئەوەی ببینرێم، گەیشتمە جێ. بە هیواشی دەروازەکەم کردەوە. جیڕەیەکی لێوە هات، جیڕەیەک کە هەرزوو لە لایەن ئەو سەگە وریایانەوە قۆسترایەوە و، چونکە من ئیتر لە دەرگای ژوورەکەی نزیک بووبوومەوە، بە مڕەمڕێکی دڕەوە، کە پاشان بوو بە وەڕەوەڕێکی تەواو، وەڵامیان دایەوە. هەر ئەوساش گوێم لە خشەخشی پێیەکانیان بوو کە بە تووڕەییەوە بەسەر ئەرزی بەردەمی ژوورەکەیاندا دەهێنا و وەکوو شڵپەی قامچی بەر ئەرزەکە دەکەوتن. بێ ئەوەی بوێرم دەست لەسەر زەنگەکە داگرم، ماوەیەک لەبەر دەرگاکەدا وەستام. تەواو بێدەنگ و کشومات بوو. وەکوو ئەوەی هەردوو سەگەکە و منیش لە چاوەڕوانیی ئیشارەتێکدا بین، تا وایان لێ بکات بە هێزیکی نوێوە دەست بە وەڕەوەڕی خۆیان بکەنەوە. تەنیا دەستداگرتنێکی کەمیش لەسەر زەنگەکە بەس بوو بۆ ئەوەی بە تووڕەیی و لوورەلوورەوە خۆ بە دەرگا داخراوەکەدا بکێشن و منیش لە ترساندا بۆ دواوە گەڕامەوە.

هەر لەو کاتەدا گوێم لە ترپەی هەنگاو و دەنگێک بوو کە هەوڵی دەدا سەگەکان بێ دەنگ بکات و پاشانیش دەرگاکە هێندە بە پەلە خرایە سەر پشت کە پێیەکانی خستمە حەشۆکە و لەرزین. ئەوجا بەرپرسیارەکە لەنێوان هەردوو سەگەکەیدا لە بەردەممدا قووت بووەوە. بە هەموو هێزییەوە هەوڵی ئەوەی دەدا ڕێ لە سەگەکان بگرێت، تا پەلامارم نەدەن. لاشە زەبەلاحەکانیان خۆیان بۆ قەڵەمباز بە ڕووی مندا ئامادە کردبوو، بۆشایی نێو دەرگای کراوەش بە ورگە هەڵئاوساوەکانیان، بە خشەخشی دەستوپەلیان و بە لمۆزە پڕ لە لیک و هەڵئاوساوەکانیان پڕ بووبوو و هەناسەسواریشیان بە بۆنێکی ناخۆش و شیرین بەنجی کردم. یەکێکیان دەستەکانی خستە سەر شانم و منیش سەیری لمۆزە سوور و تۆقێنەرەکانیم کرد، کە زمانی وەکوو پارچەگۆشتێکی زیندوو لەنێویدا دەگەڕا و دەلەرزی و کەڵبەکانیشی لەنێو دەریایەک لە لینجی و لیکدا بە ئاستەم دەبریسکانەوە.

زریکەیەکم لێ بەرز بووەوە. بەرپرسیارەکە پێکەنی و بۆ هێورکردنەوەی سەگە تووڕەکانی دەستی بە مل و پشتیاندا هێنا. پاشان چەند کلۆشەکرێکی هەڵدایە ناو لمۆزە لیکن و داچەقاوەکانیانەوە و یەک دوو کلۆشی بۆ من هەڵدا و هەر بە پێکەنینیشەوە بانگی لە یەکێک لە ژوورەکەی پشتیەوە کرد تا بێت و پێشوازیم لێ بکات. پاشان خۆی و سەگەکانی ون بوون.

بەڵام من دەرگاکەم بەخێرایی بەیەکدا دا و بەسەر پلیکانەکاندا بەرەوخوار بوومەوە. لەبەر دەروازەکەدا بۆم دەرکەوت کە نامەکەم بە جێ نەهێشتبوو. بە پێدزکە و وریاییەوە گەڕامەوە و نامەکەم لەبەر دەرگای ژوورەکەیدا دانا.

***ئەوسا***، کە هێشتا فێری ئەوە نەبووبووم قژم بهۆنمەوە، ڕێم دەدا، هەموو بەیانییەک، (ئەننا) بۆم بهۆنێتەوە. ئەو بەیانییەش، وەک هەر بەیانییەکی تر، خەریکی ئەوە بوو قژم بۆ بکات بە دوو پرچی پڕ و ئەستوور، کاتێک کە یەکێک لە گەورەکچەکان بە خۆی و گۆڤارێکی یاساغەوە خۆی کرد بە ژووردا و بەوپەڕی نهێنییەوە بە گوێیدا چرپاند. (ئەننا)ش کتوپڕ پرچە نیوە تەواو بووەکانی بەردام و پێکەوە خۆیان لە سووچێکی ژوورەکە خزاند و بە خۆشییەوە دەستیان کرد بە گەڕان بەنێو گۆڤارەکەدا. لە کاتێکدا کە نەیاندەهێشت بەشداریی نهێنییەکانیان بکەم ویستم بە دزییەوە بڕۆمە دەرەوە؛ بەڵام بەر لەوەی دەرگاکە پێوە بدەمەوە (ئەننا) هاواری لێ کردم: خوشکێ، کاتێک کە بەسەر ڕێگا سەرەکییەکەدا دەڕۆیت، وریا بە و ڕووبەڕووی ئەو پیاوە نەبیتەوە کە مقەستێکی گەورەی پێیە. ئەوەتا لە گۆڤارەکەدا نووسراوە کە بە مقەستەکەی قژی کچە بچکۆلەکان دەبڕێت، دەیفرۆشێتەوە و هێشتاش پۆلیس نەیتوانیوە بیگرێت.

بۆ دوای نیوەڕۆ نێردرام بۆ ماڵی قەشەکە و لە ڕێگاشدا بە نزیک پیرەژنێکەوە ڕێم دەکرد، چونکە لەوە دەترسام ڕووبەڕووی ئەو پیاوە ببمەوە کە مقەستەکەی پێیە. بەڵام پێشوازیی پڕ لە دڵنەوایی ژنی قەشەکە وای لێ کردم کە ئەوم لە بیر بچێتەوە و بەدەم گۆرانیوتنەوە، بەسەر ئەو ڕێگا چۆڵ و تەنیایەدا بەرەو ماڵ بوومەوە. هەر لەسەر ئەو ڕێگایە، لە پڕێکدا، چاوم بە پیاوێکی جلداتەکاو و شڕۆڵە کەوت کە بەرەو ڕووم دەهات و یەکسەر ئاگادارکردنەوەی کچەکانم بە بیردا هاتەوە. بەسەر چاڵەکەدا بەرەو ئەوبەری ڕێگاکە قەڵەمبازم دا. بەڵام پیاوەکەش هەنگاوێکی بەسەر چاڵەکەدا هەڵهێنایەوە و لە

هەمـان بەری ڕێگاکەدا بەرەو ڕووم هـات. دەمـویست بگەڕێمـە دواوە و هەر لەو کـاتەدا ئەو بانگی لێ کـردم کـە نەتـرسم. بێ جووڵە لە جێیـەکەی خـۆمدا وەسـتـام و هێندەی نەبرد ئەویش گەیشتـە سەرم. بە ڕوویەکی خۆش و خەمبـارەوە سەیری کردم و پاشـان وتی: قژت چەند جوانە! و دوایی بە دەسـتە زبرەکەی دەسـتی بە ڕوومـەتمدا هێنا. لە ترسـاندا چنگم بە پرچەکانمدا کرد. پێ وتم کە پێویست ناکات بترسێم و هاوکاتیش خەریکی دەسـتـهێنان بوو بـە جلەکـانیـدا. لەو کـاتەدا بیـرم بۆ لای ئەوە چوو: هەر ئێسـتـا مـقـەسـتـەکەی دەردەهێنێت و، دەسـتم لە پرچەکـانم توندتـر کـرد. بەڵام مـقـەسـتی دەرنەهێنا و لەنێـو دەستێکیدا هێشتیـەوە و دەستـەکەی تریشی خـستبووە سـەر شـانم. لەپڕێکدا ئاهـێکی هەڵکێـشـا و کـەوتە ڕێکخـسـتنەوەی جلەکـانی. لە گـیـرفـانیـشی نوقـووڵێکی تەڕی دەرهێنا و بۆی درێژ کـــردم. بەڵام من نوقـــووڵـەکـــەم فـــڕێ دا و بـە پرچی نەقرتاوەوە بەرەو ماڵ بوومەوە.

**ئەگەر** کەست هەبێت خۆشی بووێیت، لە جەژنی کریسمسدا دیاری وەردەگریت. زۆر گرنگە کەسێکت هەبێت، خۆشی بووێیت، بە تەنگتەوە بێت و تۆش بزانیت کە جێورێیەکت لە دڵی کەسێکدا بۆ خۆت گرتووە. چونکە مرۆڤ ناتوانێت تا هەتاهەتایە هەر لە خانەی منداڵاندا بمێنێتەوە! زۆرجاران گەورەکچەکان ئەمەیان وتبوو ـ بەڵام من نەمدەزانی کە کەسێک هەبێت منی خۆش بووێت و بتوانم، کاتێک کە چیتر ناخوازن لە خانەی منداڵانەکەدا بمێنمەوە، بچم بۆ لای.

چەند هەفتەیەک بوو، بەر لە نووستن، هەموو ئێوارەیەک گوێم بۆ ئەو چیرۆکانە ڕادەدێرا کە کچەگەورەکان لەبارەی جەژنە کریسمسە بەسەرچووەکانەوە بۆ یەکتریان دەگێڕایەوە، هەر لەبەر ئەوەش کە ئیتر ئەم جەژنی کریسمسەش نزیکتر دەبووەوە، جەژنە بەسەرچووەکان و دیارییەکانیش تا دەهاتن جوانتر و قەشەنگتر دەبوون.

هەندێک لە کچەکان بە دیار قەڵەم و کاغەزەکانیانەوە، لەسەر جێگاکانیان، پاڵ دەکەوتن و لە لیستەدا ناوی ئەو شتانەیان دەنووسییەوە کە خوازیار بوون لە دایک و باوک و خزمەکانیانەوە بە دیاری وەریانبگرن. منیش پڕ بە دڵ حەزم دەکرد لیستەیەک بۆ ئەو شتانە بکەم کە خوازیار بووم وەریانبگرم، بەڵام لیستە بۆ کێ بنێرم، من تەنانەت نەمدەزانی کە ئاخۆ هیچ دایک و باوکێکم هەن ـ کاتێک باسی لیستەکەمم بۆ کچەکانی تر کرد، پێم پێکەنین و وتیان: تۆ بۆ کێ دەنووسیت؟ تۆ کە کەس نازانێت لە کوێوە دێیت! خۆ ئەگەر کەسێکیش سەروبەری لە هیچ جێیەکەوە دیار نەبێت، ناکرێت چاوەڕوانی ئەوە بێت هیچ دیارییەکی لە هیچ کەسێکەوە پێ بگات!

بەڵام ـ ئاه، چەندێ بە ئاواتەوە بووم دیارییەکم لە کەسێکەوە بۆ بێت، چەندە بچکۆلەش بووایە، گـرنگ نەبوو، هـەر ئەوەندە دیارییـەک بـووایە لە کـەسـێکەوە، تا کـچـەکـانی تـر بە چاوی خۆیان بیانبینیایە کە منیش سەروبەرم بە جێیەکەوەیە!

لـەو ژنـەم پـرسـی کـــە چاودێریی دەکـــردین ئاخـــۆ لـەو بڕوایەدایە، ئـەگـەرچی من سـەروبەرم لە هیچ جـێـیـەکـیـشـەوە دیار نییە، هیچ دیارییەکم بە دەست بگات. ئەو پێکەنـی و وتـی: ئەمـە چ قسـەیەکە کە تۆ سـەروبـەرت لە هیچ جێیـەکـەوە دیار نیـیـە؟ ئێـمـە هـەر هـەمـوومـان لە جـێـیـەکـەوە دێین و بێگـومـان دیارییـەک بۆ تۆش دێت، چاوەڕوان بە تا بـزانین وایە یـان نـا! ئەو هێندە بە دڵنیاییەوە قسەکانی کرد کە ئیتر باوەڕم پێکرد و هـەسـتـم بە هـێـمـنـی و دڵشـادیش کـرد. بەڵام کـاتێک کـە بۆ کـچـەکـانم گـێـڕایەوە کـە ئەوەی وتووە و پەیمانـی گـەیشـتنی دیارییـەکیشـی پێداوم، بە پێکەنینەوە وەڵامـیـان دامـەوە: ئەو هـەر لەبەر ئـەوەی دڵتـەنگ نـەبیت ئەوەی وتووە! و ئـیـتـر منیش دیسان کەوتمەوە دڵەڕاوکە و گومانەوە ـ

ئاخرییەکەی شەوی کریسمس هات.

هـەمـوو دەسـتـی یەکـتـرمـان گـرتـبـوو و بە دەوری سنەوبەری جەژندا سەمـامان دەکرد و گۆرانیمـان دەوت: بەسـەر سـەوزیی درەخـتـەکـانەوە بریقـوباقـی جـەژن دەدرەوشـێـتـەوە ـ منیش لەنێـوان کچێک و ئەو ژنەدا کە سـەرپەرشـتی دەکـردین هـەر هـەڵدەبـەزیمەوە و قـۆڵێکم بە قـۆڵی کـچـەکـەوە و قـۆڵەکـەی دیکەشم هـەڵبـڕیبـوو، تا بتـوانم دەسـتم لە دەسـتی ژنە سـەرپەرشـتکارەکـەمـان بەر نەبێت و هـەرزووش قـوڵم کـەوتە ئێش و لەتـاو ئێش و ئازار بـە زەحـمـەت دەمـتـوانـی گۆرانییەکەیان لەگەڵدا بڵێمەوە.

سەرەتا هەموو بە ئاراستەیەک سەمامان بە دەوری سنەوبەرەکەدا دەکرد و پاشانیش بە پێچەوانەوە و سنەوبەرەکەش هێندە بەرز بوو سەری دابوو لە بنمیچەکە و هێندەش پانوپۆڕ بوو کە دە دەست و قۆڵی درێژکراوی منداڵانەی دەویست تا پێیدا بگاتەوە. لە گشت لایەکەوە بۆن و بەرامەی مۆم و دارستانی سەروو و سنەوبەر دەهاتن و هێندەش بە گڕی مۆمەکان ڕووناک بووبووەوە، کە چیتر لە گەڵا و لق و پۆپە چڕوپڕەکانی نەدەترسام ـ لە کاتێکدا کە من هەردەم ترس دایدەگرتم، کاتێک لە تاریکیدا بە لای سەروو و سنەوبەرەکانی دارستاندا تێپەڕ دەبووم.

تاڵەدەزووی زیوینی بەبریقوباق لە سەرەوەی سنەوبەرەکەوە تا بنەوەی شۆڕ بووبوونەوە و وەک خاچێکی دارینی دەورەدراو بە چڵ و گەڵاکانی دەینواند! بە لقەکانیەوە زەنگۆڵەی بچووک بچووکی لە زیو هەڵکێشراو و ئەو دڵە سوور و سپییانە هەڵواسرابوون کە من خۆم لە دروستکردنیاندا بەشدار بووبووم. دڵەکان هەڵئاوسابوون، چونکە کرابوون بە کیسە و پڕ لە شیرینی کرابوون. زەنگوڵەکان، بە ئاستەمێک، بەو بایەی کە لە سەماکەی ئێمەوە دەهات دەزرنگانەوە و گشت مۆمەکانیش قژە ئاگرییەکەی خۆیان بۆ پێشەوە داهێنابوو، بەڵام هەر کە لە سەماکردن دەوەستاین، ئەوانیش قژیان بەولادا هەڵدەدایەوە.

دیارییەکان لەسەر ئەو مێزەی تایبەت بۆ ئەو جەژنە ڕازێنرابووەوە دانرابوون: بریتی بوون لە پاکەت لە هەموو قەبارە و لە گشت شێوەیەک، بەڵام گەورەترینەکانیان لە ژێر مێزەکەدا دانرابوون. بە تاسە و ئارەزووی دیارییەکانەوە بووم، کەچی هێشتا سەماکە کۆتایی نەهاتبوو، بە نابەدڵییەوە

ڕاپێچ دەکرام و پێم وابوو کە ئەستێرەی جەژنی کریسمسیش زۆر بە بەرزی بە بنمیچەکەوە هەڵواسراوە، ئەوەندەم سەیر کرد، ملم کەوتە ئێش و کاتێکیش بە سەماکردنەکەوە ڕوومان بۆ لایەکی دی وەرگێڕا، فریای ئەوە نەکەوتم کە بە خێرایی قاچم بگۆڕم و خەریک بوو لەبەر تێکئالآنی قاچەکانم دەکەوتم. بەڵام ژنە سەرپەشتکارەکەمان به توندی قۆڵە درێژکراوەکەمی گرت و بەدوای خۆیدا کێشی کردم، بە جۆرێک کە دەبوو زیاد لە پێویست هەنگاو هەڵبهێنمەوە تا هەقی ئەو هەنگاوانە بکەمەوە کە لە کیسم چووبوون. تەواو گێژ بووبووم و لە خۆم دەپرسی ئاخۆ کەی ئەم سەمایە کۆتایی دێت، بەڵام سەرپەرشتکارەکەمان دەستی بە سەرەتای گۆرانییەکی تر کرد، سەماش بەردەوام بوو و منیش کە هاوکات شاد بووم و زوو زوو هەڵدەنووتام و دەشترسام، بە ڕاکەڕاکە دوایان دەکەوتمەوە.

زۆربەیان بە کامی دڵ گۆرانییان دەوت، بەڵام من دەمێک بوو بێدەنگ بووبووم. نەمدەتوانی بەدەم سەرسمەوە و بە قۆڵی شل و شەکەتەوە، لەکاتێکدا کە جارێک سەرم بۆ سنەوبەرەکە هەڵدەبڕی و جارێکیش تەماشای دیارییەکانم دەکرد و هاوکاتیش دەبوو گۆرانی بڵێم، لەسەر ڕاکەڕاک بەردەوام بم! هێز و بڕستم لەبەر بڕابوو و قورگیشم پڕ بووبوو لە گریان، کاتێک کە لە گۆرانی و سەما و هەڵپەڕکێ کەوتن و دەستی یەکتریان بەردا، ئەوسا ئیتر هێدی هێدی سەرپەرشتکارەکەمان بەرەو لای مێزەکە بووەوە و بێدەنگی و کشتوماتییەکی تاقەتپرووێنیش ئەو ناوەی گرتەوە. منیش لەشبەبار و دەمداچەقاو دوای کەوتم. ئەو خۆی بۆ مێزەکە درێژ کرد و نەختێک بە بێدەنگی، بۆ ئەوەی سەرنج و

چاوەڕوانیمان بۆ لای خۆی ڕابکێشێت، لە تەنیشتیەوە ڕاوەستا. دەمێکی هێندە درێژخایەن بوو کە من پێم وابوو ئیتر هیچ شتێک ڕوو نادات ـ

ئاخرییەکەی خۆی بەرەو مێزەکە چەماندەوە و پاکەتێکی هەڵگرت و بۆ ماوەیەک لەو ناوە ڕاما کە لەسەری نووسرابوو و ئەوجا خوێندیەوە. کچێک بەپەلە ڕایکردە پێشەوە و دیارییەکەی وەرگرت، بە پەلەش بۆ دواوە گەڕایەوە و خۆی لە کونجێک خزاند و بۆ ئەوەی پاکەتەکەی بکاتەوە لەسەر ئەرزەکە لێی دانیشت. ئیتر بەو شێوەیە بەردەوام بوو. سەرپەرشتکارەکە، یەک لە دوای یەک، ناوەکانی دەخوێندەوە و کچەکانیش دڵشاد و خەنی خۆیان هەڵدەدایە بەردەمی و پڕیان بە پاکەتەکانیاندا دەکرد و بۆ ئەوەی بیانکەنەوە لەسەر ئەرزەکە لێی دادەنیشتن. ئەرزەکە پڕ بووبوو لە خشوهوڕی کاغەزی چرچولۆچکراو، داوەبەنی پێچانەوەی گرمۆڵەکراو و یاریی منداڵانەی تازە و دیاریی هەمەچەشنەی تر، دەنگی پڕ لە خۆشی و شادیی کچانیش کە هاواریان دەکرد: تەماشاکە! تەماشاکە!، دەنگی دەدایەوە و ژوورەکەی پڕ کردبوو.

من لە لایەکەوە ڕاوەستابووم، دڵەخورپە دایگرتبووم: هێشتا ناوی من نەخوێنراوەتەوە، لە کاتێکدا ناوی هەندێ لە کچەکان دوو و سێ جار خوێنراونەتەوە و پاکەتەکانی سەر مێزەکەش خەریکە تەواو دەبن ـ

دەنگی خۆشی و شادیی ئەوانی تر ئازاری دەدام، هەستم دەکرد تەنیا و دوور لەوان ماومەتەوە، منیش پڕ بە دڵ دەمویست لەگەڵ ئەواندا لەسەر ئەرزەکە لێی دانیشم، پاکەت بکەمەوە و وەکوو ئەوانیش هاوار بکەم. نەمدەویست لەوان جیاواز بم، دەبێت پاکەتێک بۆ منیش هەبێت. ئارەقەی سەر

تەوێڵـم دڵۆپەی بەسـتـبـوو: بیـر بکەرەوە ئـەگـەر... ــ بەڵام نا، هێشتا دیارییەپاکـەتە گەورەکانی ژێر مـێزەکە لە جێی خۆیان مابوون.

لە سـەرپەرشـتکار و مێـزەکـە چوومـە پێـشـەوە، بێ دەنگ سـەیری لێوەکـانیم کرد، بەڵام هـێشـتا هەر بانگی ناوی خـۆمم نەدەهاتە بەر گـوێ. فرمێسکـەکانم قـوڵپیـان دەدا، لێوەکانم کـەوتبـوونە لەرزەلەرز، دەسـتـەکـانم یەکـتریان هـەڵدەگوشی و لەبەر خـۆمـەوە دەمـوتـەوە: دەبا پاکـەتێکی بۆ منیش تیـا بێت! دەبا هـەر هیـچ نەبێت کەسێکیش هـەبێت حەزی لە من بێت! دڵ پڕ لە خـورپە لە کچـەکـانی ترم دەڕوانی، کـە لەسـەر ئەرزەکـە دانیشـتبوون و ڕوومـەتەکانیان لە خـۆشیاندا داگیرسابوون. ئاخر منیش دەمویست لەگەڵ ئەواندا دانیشتم!

بە لاچاوێک سـەیری ژێر مـێـزەکـەم کـرد و بینیم هـێـشـتـا چەند پاکـەتێکی لێ مـاوە، بیرم کـردەوە ڕەنگە یەکێک هێشتا هـەر... ــ بەڵام نا وا یەکێکی تر و یەکێکی تریش دیار نەما ــ

ئێسـتـا ئیـتـر تەنیـا دوو پاکـەت، ... یەک پاکـەتی لێ مـاوە و ... وا هـیـچـی لێ نەما!

وەکو ئەوەی لە پەلوپۆ کـەوتبم لەوێدا ڕاوەستـابووم. پاکـەتی لێ نەمـا! کـەس نـەبوو منی بە لاوە گـرنـگ بێت! سـەروبەرم بە هیـچ جـێـیـەکـەوە نەبوو! ئایا من هیـچ جـێیـەک نییـە، کاتێک کـە چیـتر خـانەی مندالانەکە ناتوانێت ئاگاداریم بکات، ڕووی تێ بکـەم! ئـاه، مـنـداڵـەکـــــانـی تر ڕاســــتـــیـــــان کـــــرد! سـەرپەرشتکارەکەش درۆی بۆ کردبووم!

بە لـووشـکـەلـووشـک و گـــــــریانـەوە ڕامـکـردە بـەردەمـی سـەرپەرشکـارەکـە و بەدەم قـیـژە و گـریـەوە بە مـشـت تێی بەر بووم: تـۆ درۆت بۆ کــردووم! تـۆ پەیمـانت پێــدام کـــە مـنیـش دیارییەک وەردەگرم!

ئەو کــە تا ئەو کــاتــەش هەســتــی بەوە نەکــردبوو کــە لەنـێــو پاکەتەکاندا هیچی بۆ من تێدا نییە، بەتوندی قۆڵی ڕاکێشام و وتی: هـێــمن بە، هـێــمن! هـەر ئێــســتــا پاکــەتێک بـۆ تۆش دروست دەکەین ــ

من قیژاندم بەسەریدا و بە ڕکەبەرکێوە سەیرم کرد: ئیتر پاکەتم ناوێت!

کچەکان لە دەورم کۆ بوونەوە و شیرینی و نوقوولەکانی خۆیان بۆ ڕاگرتم، بەڵام من بەتوندی پاڵم بە دەستیانەوە نا، پێم بە ئەرزەکەدا کێشا و قیژاندم: نامەوێت، نامەوێت! و بەر لەوەی پێــــڕاگــــەم خــــێــــرا لە ژوورەکــــە بچـــمـــە دەرەوە، سەرپەرشتکارەکە قۆڵی گرتم و دیسانەوە هەوڵی دا دڵم بداتەوە و هێمن ببمەوە ــ

من چیتر هی ئەوە نەبووم دڵم بدرێتەوە و دەبوو لە جێدا لێی بکەوم و چەند ڕۆژێکیش دوای ئەوە بەدەم لەرزوتاوە لە جێگاکەمدا مامەوە ــ

***کە تاریک دادەهات،*** هەمیشە، ئەندێشە ترسێنەرەکانم، سەروەرییان بە دەست دەهێنایەوە. ئەو ئێوارەیەش وەک ئێوارانی تر لە دەوری چراکە کۆ بووبووینەوە و گۆرەویمان دەچنی. کچە گەورەکان، یەک لە دوای یەک، چیرۆکی ناخۆش و ترسناکیان دەگێڕایەوە. پڕ بە دڵ و بە ئارەزوویەکی تێکەڵ بە نیگەرانییەوە، گوێم لە چیرۆکەکان ڕاگرتبوو، هێندەی نەبرد کە لەنێو دنیای ترسەکانمدا بەند بووم: تارماییە ڕەشەکان بەنێو ژوورەکەدا کەوتبوونە جووڵە، لە بنمیچەکەوە بەرەوخوار دەبوونەوە و بەسەر ئەرزەکەدا دەخشان، لەژێر مێزەکەشدا تارماییە تێکەڵوپێکەڵەکان گاگۆڵکێیان دەکرد، لە پشتمەوە با ساردەکان هەناسەیان دەدا، لە پەنجەرەکەوە جووتێک چاوی قووڵ و هەڵکۆڵڕاوم بینی، کە تێیان دەڕوانیم. لەسەر دیوارەکانیش تارمایی باڵندەکان، لەپڕێکدا، لە شەقەی باڵیان دەدا، پاشان دەرگاکە هەبوو، ئەو دەرگایەی کە هەمیشە چاوەڕێم دەکرد شتێکی خەتەرناکی لێوە بێتە ژوورەوە، نەمدەوێرا لە جێگەکەی خۆم بجووڵێم و وەک ئیفلیجێک لەوێدا مابوومەوە، تەنانەت ئەو کاتەش کە هەستم کرد پێویستە لە خانووەکە بچمە دەرەوە، لە جێگەکەی خۆمدا چەقیم و ئازار بەدوای خۆیدا کێشی کردم، تا یەکێک لە کچە گەورەکان ڕوومەتە داگیرساوەکانی بەدی کردم و تێگەیشت. بۆ ئەوەی لەگەڵمدا بێتە دەرەوە، هەستایە سەر پێ، بەڵام هەر لەو کاتەدا دەرگاکە بە توندی خرایە سەرپشت و ئەو ژنەی یارمەتی دەدایین، بەهەناسەبڕکێ، خۆی بە ژووردا کرد و دەینالاند: پیاوەکە، بەدرێژایی ڕێگاکە، بەڕاکردن بەدوامەوە بوو!

کچە گەورەکان پرسییان: کام پیاو؟ بەڵام ئەو، قەدەرێک بوو، لە هۆش خۆی چووبوو، کەوتبووە سەر ئەرزەکە.

نەگـەیشـتم بەوەدا لـە خـانووەکـە بچـمـە دەرەوە و، لەگـەڵ ئەوەشدا ئەوەی دەبوو ڕوویدا، ڕوویدا.

تا شـەودرەنگانێک ژووری نووسـتنەکـەمـان پڕ بووبوو لە چرپەچرپی نهێنی و هەر ئەوساش بەدڵنیاییەوە لەوە حاڵی بووم: کە لەڕاستیدا پیاوێک هەیە، دەبێت بەئاگا بیت لێی و، ئەو پیاوە جارێک لە جاران لە دەرگاوە، بۆ منیش، دێتە ژوورەوە. هاتنەژوورەوەی لەناکاوی ئەو پیاوەی کە هەمیشە ترسێکی بەردەوام بوو، بەرۆکی بەرنەدەدام.

کەس باوەڕی بەوە نەدەکرد کە (ئێستەر) نەخۆش بوو. لەگەڵ ئەوەشدا کە چەند ڕۆژێک بوو بە دەست ئازاریی سکیەوە دەینالاند، کەس نەیدەویست باوەڕ بە نەخۆشییەکەی بکات.

شەوێک لە هەموو شەوانی تر زیاتر گریا. من بێ دەنگ بەسەر ئەرزە ساردوسڕەکەدا بەرەو جێگاکەی ئەو خۆم خشاند و خۆم خزاندە جێگاکەیەوە. بۆ ئەوەی نەختێک دڵی بدەمەوە، باوەشم پێدا کرد. پێکەوە گریاین، هێندە گریاین تا نەختێک لە ئازارەکەی کەم بووەوە و هاتە نێو منەوە. ئەو هێدی هێدی خەوی لێ کەوت و منیش بە بێداری و بەدەم ڕامانەوە لە جێگاکەدا مابوومەوە. بەڵام کە دەمەوبەیان بەرەو جێگاکەی خۆم گەڕامەوە، دەستی کردەوە بە لووشکەلووشک و گریان.

نەیدەویست هەڵسێت. بەدەم گریانەوە داوای دەکرد هەر لە جێگاکەیدا بمێنێتەوە، بەڵام هێشتا کەس باوەڕی بە نەخۆشییەکەی نەدەکرد. کاتێک بەرەو موبەقەکە دەچووین، تەنیا من بووم دڵنەواییم دەکرد. ئەو لەسەر کورسییەک دانیشت، بە دەنگی بەرزیش سکاڵای کرد و ناچار منیش

لەگەڵ ئەودا دەستم بە گریان کرد و داوام لە مامۆستاکەمان کرد کە ڕێ بە (ئێستەر) بدات بگەڕێتەوە بۆ ناو جێگاکەی.

مامۆستاش دەیشیڕاند: دەمتان داخەن! لەبری ئەوە وەرن یارمەتییەکم بدەن!

(ئێستەر) هەوڵی دا هەڵستێتە سەر پێ، بەڵام بەدەم گریانەوە لە جێیەکەی خۆیدا دانیشتەوە، مامۆستاش بەپەلە گەیشتە سەری و شەپازلەیەکی قایمی تێسرەواند. (ئێستەر) کەوتە سەر ئەرزەکە. مامۆستا هەر لەسەر ئەوە بەردەوام بوو بەتوندی ڕایتەکێنێت و منیش بە مشت کەوتبوومە سەروگوێلاکی و هاوارم دەکرد وازی لێ بهێنێت. هەر لەو کاتەدا شەپازلەیەکی لە منیش سرەواند و منیش بەدەم زیرەزیر و گریانەوە ڕامکردە سەرەوە بۆ ئەوەی سەرپەرشتکارەکەمان بهێنم. کاتێک کە بینی (ئێستەر) لە پەلوپۆ کەوتوو لەسەر ئەرزەکە کەوتووە، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا و وتی: ڕەنگە هەر بە ڕاستی نەخۆش بێت! پاشان لێی نەوین، هەڵیانگرت و بەرەو هۆڵی نووستنەکە بردیان و دۆکتۆریان هێنایە سەری. بەپەلە بردییانە خەستەخانە و پاش دوو هەفتە (ئێستەر) مرد.

ملتەخت! ملتەخت! ملتەخت! لە دووری دوورەوە دەمبیست، لەکاتێکدا لەسەر جۆلانەکە دانیشتبووم و بەرەو ئاسمان دیلانێم دەکرد. خۆم دزیبووەوە، تا بەهێمنی و دوور لەوانی تر، بە جۆلانێکە شاد و خەنی بم. قاچەکانم دوو سەوڵ بوون لە هەواکەدا دەگەڕان، بەرز و بەرزتر بەرەو ئاسمانیان دەبردم. کراسەکەم چارۆکەیەکی بە خشوهوڕ بوو. پرچەکانم ڕێک، وەک دوو گوریسی ئەستوور، لە هەواکەدا وەستابوون و شادیش لەنێومدا گۆرانی دەچڕی: کەس لێرە نییە، کەس لێرە

نییە. ئەو باڵندەیەی کە سێبەرەکەی خۆی بە هەوادا پەخش دەکرد، من بووم! ئەو پەپوولەیەی کەوانەیی لەم گوڵەوە بۆ ئەو گوڵ باڵەفڕێی دەکرد، من بووم! ئەسپی سپیی هەوریش کە لە دنیای شین و بێسنووری ئاسماندا دەتەقییەوە، من بووم! هەر شتێک کە دەیتوانی بفڕێت، من بووم!

بۆ ماوەیەکی کەم تەواو بەختەوەر بووم، بەڵام پاشان بە ڕاکردن و قیژەقیژ بەنێو باخچەکەدا هاتن و هاواریان دەکرد: ملتەخت، ملتەخت! و یەکەوڕاست هەموو شتێک گۆڕا و بووە مایەی ئازاردان. بە ئاستەمێک پێڕاگەیشتم لە جۆلانەکە دابەزم و خۆم بدزمەوە، گەیشتنە سەرم و هەڵقەیەکیان بەدەوردا دروست کردم و گۆرانی: ملتەخت! ملتەخت! ملتەخت!یان چڕی. تا دەستم بە گریان نەکرد، وازیان لێ نەهێنام و بە ڕاکردن و دەم بە پێکەنین بەرەو جۆلانەکە نەڕۆیشتن. لەنێو باخچەکەدا خۆم لێ ون کردن و لەپاڵ دەوەنێکدا دانیشتم. بەدزییەوە دەستم لە ملم دەدا، لەڕاستیدا تەخت بوو و، زۆریش گریام.

ملێکی وا تەخت و مێشک، لە هەمان سەردا جێیان نابێتەوە! زۆرجاران وایان پێ وتبووم و بێ لەوەش دەیانوت: هەربۆیە ئاوا دەبەنگیت و لە هیچ تێناگەیت. چەندیش پشتی سەرمم بە دیوارەکەدا دەدا، یارمەتی نەدەدا، مل هەر هەمان مل بوو و هەرگیز نەیدەویست وەکوو ملی کچەکانی تر خڕ بێت. دڵنیابووم لەوەی، لە هەموویان گەلۆرتر و دەبەنگترم.

***لەرزوتا*** هات و هەموومانی داگرت و لە ژوورێکی چۆڵوهۆڵی گەورەدا لەپاڵ یەکدیدا درێژی کردین. شەوانە، تەندروست و ڕوومەتئاڵ، لێی پاڵ دەکەوتین و بەیانیان لەشبەبار و بێهێز، بە دوو چاوی کوتوکوێرەوە، لە دنیایەکدا کە پێیەکانی لە لۆکە بوون و بە دەوروپشتماندا دەهات و دەچوو، بە ئاگا دەهاتین. بۆ خانوویەک کە کتوپڕ وەکوو خەستەخانەیەک بۆ ئەو مەبەستە، لە دەرەوەی دیوارەکانی قەڵاکەمان، ڕێکخرابوو، گوێزراینەوە و بۆ ماوەیەک؛ دوو هەفتە، سێ هەفتە، مانگێک ماینەوە و ئاگامان لە یەکتر بڕابوو، تا ئەو کاتەی بەیانییەک بە چاوە داگیرساوەکانمان و، بە ئارەزوویەکی زۆرەوە بۆ ئازاردانەوەی یەکتری، لە جێگاکانمان هەڵسراینەوە. وتیان: ئیتر تەندروستن و ڕەوانەی خانەی منداڵان کراینەوە و ئیتر دیسان قەڵاکە ئاوێزانی ژیانی ئەفسانەیی خۆی بووەوە.

بەڵام من تووشی نەخۆشییەکی تر بووم و خرامە خەستەخانەی خانەی منداڵانەکەوە. ماوەیەکی دوورودرێژ بە تەنیا لەوێ مامەوە و هەر تەنیا کورسییە چۆڵوهۆڵەکانم هەبوو کە قسەیان بۆ بکەم، یان دەرگای سپیی ئەو دۆڵابانەی کە جارنا هەر لە خۆیانەوە و بێ ئەوەی کەسێک دەستیان بۆ بەرێت دەکرانەوە، هەندێ جاریش دەموێرا بە چرپە ئەو درەختانە بدوێنم کە هەمیشە لە پەنجەرەکەوە سەرەتاتکێیان لەگەڵدا دەکردم. لەشم هێندە بە بار بوو، کە ماوەیەکی دوورودرێژ نەیدەتوانی خۆی لە ژێر بارە قورسەکەی خۆی قوتار بکات. تەنیا مێشک و چاوەکانم بوون کە گەورە دەبوون و دەدوان.

ئەوجا کچەکان هاتن و دیدەنییان کردم. لە سەرەتادا دەبوو یەک یەک بهاتنایە و کەمۆکەیەک بە ترس و شەرمەوە

لەسەر قەراغی جێگاکەم دادەنیشتن. هێدی هێدی لەو هەست و لەشسڕبوونەی تووشی بووبووم بە ئاگایان هێنامەوە و لە دواییشدا دەستە دەستە هاتن و وەکوو پۆلەباڵندە بەسەر جێگاکەمدا دەستیان بە جریوەجریو کرد و پاشان بەتەواوی خەبەرم بووەوە و دەستم کردەوە بە گوێگرتن لە قسەکانیان و تا دەهات کورسی، دەرگای دۆڵابەکان و درەختەکانیش دوورتر و دوورتر دەکەوتنەوە لێم.

ڕۆژێکیان یەکێک لە کچەکان بۆی گێڕامەوە کە زیرەکییان تاقی کراوەتەوە و ئەوانەی کە لە تاقیکردنەوەکەدا دەرنەچوون خراونەتە بەشی منداڵە نازیرەکەکان؛ ئەو بەشەی کە منداڵە شێتووێتەکانیشی لێ بوو. هەر کە تۆش چاک بوویتەوە، تۆش تاقی دەکرێیتەوە. بەتەواوی تۆقیم. دڵنیا بووم لەوەی، کە بەو ملە تەختەوە، لە تاقیکردنەوەکەدا دەرناچم و دەمهێنایە پێش چاوی خۆم کە چەندە ناخۆشە بخرێیتە بەشی منداڵە نازیرەکەکانەوە. پێشتر چەند جارێک بە لای ئەو بەشەدا ڕەت بووبووم و هەرجارێکیش یەکێک لە کچە گەورەکان قۆڵی ڕاوەشاندبووم و وتبووی: ئاگات لە خۆت بێت، لێرە شێتەکان دەژین! ئەگەر بتبینن بەردت تێ دەگرن. ئەی ئێستا، ئێستا ئیتر لەوە بوو خۆم بخرێمەوە ئەو بەشەوە و تا ڕادەیەکی زۆریش لەوە دڵنیا بووم کە هەر ئەوێ دەبێت بە جێم.

لەپاڵ مێزێکدا کە لە تەنیشت پەنجەرەکەوە دانرابوو دایاننام و چنگێک پارەیان خستە بەردەمم. بەڵام من قەت پێشتر پارەم نەدیبوو و، هەربۆیە بەپێی گەورە و بچووکییان نرخاندمن. پاشان چەند پارچەتەختەیەکی یاریکردنیان دامێ و منیش بەخت یارم بوو و توانیم قەلایەکی ڕەشیان لێ دروست بکەم. دەشمزانی کە دوو و دوو دەکەنە چوار، بەڵام

کێشانی سێو لەسەر تای زێڕینی تەرازووەکەم بۆ نەچووە سەر و لە دواییشدا کە بێتوانایی خۆمم لە جیاکردنەوەی گورگ لە سەگ پێشان دان، ڕێیان دام بڕۆم. دەستیان بە پشتملمدا دا و ئەو سێوەیان دامێ، کە نەمتوانیبوو بیکێشم. لە سەرنەکەوتنی خۆم دڵنیا بووم.

بۆ ئێوارە سستەرەکەمان پێی وتم کە بۆ بەشی منداڵە نازیرەکەکان دەنێردرێم. بە درێژایی شەو گریام و بۆ سبەینێ بەیانیش لە جێگاکەم ڕاست نەبوومەوە و وەکوو چیلکەیەک خۆم ڕەق کردبوو. نەمدەویست چاو بکەمەوە. پەلیان ڕاوەشاندم، بەڵام من بەبێ ئەوەی چاو بکەمەوە خۆم توند گرمۆڵە کردبوو. گوێم لە یەکێک بوو وتی: لەو بڕوایەدام شێت بووبێت! بە بیستنی ئەوە بەدەم گریانەوە لە جێگاکەم دەرپەڕیم و بەسەریاندا قیژاندم کە شێت نەبووم و نازیرەکیش نیم و ناشمەوێت بگوێزرێمەوە بۆ ئەوێ. ئەوسا پێم پێکەنین و وتیان کە لەگەڵ کچێکی دیکەدا تێکەڵیان کردووم و قەتیش بۆ بەشی منداڵە نازیرەکەکان ناگوێزرێمەوە.

**ئێدیت**! ئێدیت!... کە مەترسییەک لێمان نزیک دەبووەوە، هاوارمان لە ئێدیت دەکرد. (ئێدیت) لە هەمووما‌ن ئازاتر بوو. (ئێدیت) بە سەماوە بەنێو هەموو ناخۆشییەکاندا دەرباز دەبوو. دەیتوانی هەم ڕەق و بەدکار و هەم چاک و دۆستیش بێت و هەر هەمووشمان بە سەرسوورمانەوە لە ئازایەتی و ڕەق و بەدکاریی ئەو ورد دەبووینەوە.

(ئێدیت) هاوڕێی من بوو. هەمیشە لە بەرانبەر کچەکانی تردا لەسەر من بە دەنگ دەهات و هەر ئەوەش بوو وایکرد کە جێگاکەم بە تەنیشت جێگاکەیەوە بێت. کە من هێشتا شەش سالان بووم، (ئێدیت) سیانزە سالانی پڕ کردبووەوە. قەت من تەماشای (ئێدیت)م وەکوو ئەو کچە گەورانە نەدەکرد کە دەبوو لێیان بترسێیت. ئەو زۆر لەگەڵم نەدەدوا، بەڵام قەتیش بە ملتەخت بانگی نەدەکردم و هەموو شەوێکیش دەهاتە پاڵ جێگاکەم و بەتانییەکەی تێوە دەپێچام.

بەڵام ئەو ڕۆژە هات کە دەبوو هەموومان بچین بۆ لای دۆکتۆر. کە من چوومە ژوورەوە، هێشتا (ئێدیت) پێراناگەیشتبوو جلەکانی لەبەر بکاتەوە و لەوێدا گەورە و سپی ڕاوەستابوو و لەنێو ڕووتوقووتیی خۆیدا نامۆ دەینواند. نەمتوانی تەماشای نەکەم. نەمتوانی ڕوو لە مەمکە خرتوخۆڵ و پێچوپەنای ڕانە تۆکمەوتۆڵەکانی وەرگێڕم.

بە تووڕەییەوە بەسەریدا قریشکاندم: تەماشای چی دەکەی! و پاشان باوەشی بە جلەکانیدا کرد و دەرپەڕییە دەرەوە.

دۆکتۆرەکە پێمان پێکەنی: تۆش کە گەورە بوویت وەکوو ئەوت لێ دێت و لەگەڵ قسەکانیدا ئاماژەی بۆ دوو ئەستێرە سوورە بچکۆلەکەی سەر سنگم کرد.

منیش وام لێ دێت! نامەوێت. ناشیرینن، لایان دەبەم. نامەوێت گەورە بم.

کــە هـاتمە دەرەوە، (ئێــدیت) لەوێ وەســـتــابوو و چاوەڕێی دەکردم. تووڕە دیار بوو. پڕی کرد بـە قژمـدا و چەندێ توانـی تێی سرەواندم و بە منداڵێکی خۆتێهەڵقورتێن و ڕەزاگرانیش ناوی بردم.

من هیچ لە مەسـەلەکە تێ نەگەیشتم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەستم دەکرد هەم گوناهبار و هەم بێگوناهیشم!

زۆری خــایاند تـا (ئێــدیت) جـارێکی تر قـســەی لەگــەڵدا کردمەوە.

کاتێک بەنێو دارستانەکەدا دەڕۆیشتین، ئەوەندە خـۆشمان هـەبوو پێکەوە هـەرچـی ترس و خـــۆفـــە لـە بیـــرم کـــردبـوو. بەدرێژایـی پیـاســـەکـەمـان باسکی لە شــانم ئاڵاندبـوو و پێی دەوتم کـە منـی زیاتر لە هـەمـوو کچـەکان خـۆش دەوێت و قـەت دەست لـە یەکــتــر بەرنادەین و منـیش دڵم بە قـــســـەکـــانـی دەکرایەوە و هـەستم بە شـادی و دڵنیایی دەکرد.

بەنـێـو دارســتـــانەکــەدا ڕەت بووبـووین، هێندەی نەمــابوو بگەینەوە و لە دوورەوە بەشـێک لە ڕێگا سـەرەکییەکەمـان لێوە دیار بوو، کاتێک گوێمـان لە دەنگی خەمباری شـمشـاڵێک بوو، بە ترسەوە ڕوومـان لە قووڵایی ئەو لایەی دارستـانەکە کرد کە پێـــمــــان وا بـوو دەنگەکـــەی لێــــوە دێت و چاومــــان بـە شـمشـاڵلێدەرەکە کـەوت. ئەو پیاوەی کە زۆرجاران لێی بە ئاگا دەهێنراینەوە، بەدەم شـمـشــاڵلێدانەوە لـەنێو دارسـتـانەکەوە دەهـات و کـاتێکیش کـە چاوی بە ئێـمـە کـەوت، وا دەهـاتە بەر چاومـان کـە بەرەو لای ئێمـە پێی هـەڵگرتووە. پێیـان وتبـووین: ئەگــەر بۆ چاوترووکـانێکیش بوەسـتین و گـوێ بۆ ئاوازەکـەی ڕادێرین، ئیــتـر تـەواو و لە دەست چوون! و ئێــمـــەش بە پـەلە پێمان هـەڵگرت و بەرەو ڕێگا سـەرەکییەکە کەوتینە هـەڵەداوان.

(ئێدیت) بێ ئەوەی چاوەڕوانیی من بکات ڕایدەکرد و هاواری دەکرد: ڕاکە! خێرا ڕاکە! زۆر پێش من کەوتبوو و هێندەی نەمابوو بەتەواوی بگاتە سەر ڕێگا سەرەکییەکە و منیش ڕامدەکرد و پێیەکانم تێکەڵ دەبوون و سەرسمم دەدا و بە ئەژنۆی خوێناوی و قورگی پڕ لە گریان و هاوارکردن لە (ئێدیت)ەوە هەڵدەستامەوە، بەڵام ئەو تازە لەو سەرەوخوارکە بچکۆلەیەش، کە بەرەو خانەی منداڵانەکە دەبووەوە، ئاودیو بووبوو. کاتێک منیش گەیشتمەوە خانەکەمان ئەو بەوەدا گەیشتبوو باسوخواسی بەیەکگەیشتنەکەمان لەگەڵ شمشاڵلێدەرەکەدا بۆ دەستەکچێک کە لە دەوری کۆ بووبوونەوە بگێڕێتەوە، کە هیچ کەسێکی تر پێشووتر نەیدیبوو.

من پەلامارم دا و سەرزەنشتی ئەوەم کرد کە زۆر ترسنۆکانە بە جێی هێشتووم و بە ڕێی خۆیدا ڕایکردووە و ئەویش بەوپەڕی ڕقەوە پاڵێکی پێوە نام و بەدەم لووشکەلووشک و گریانەوە کەوتمە سەر ئەرزەکە. ئەوجا بووین بە دوو دەستەوە و دەستمان کرد بە بەردەفڕکێ بۆ یەکتری و لەو کاتەدا کە خەریک بووم بەردێکی گەورە بگرمە (ئێدیت)، کچەکان دەستیان بە فڕکان فڕکان کرد، هەریەکە و بە لایەکدا کەوتنە ڕاکردن و هاواریان دەکرد: سەگەکە هات! سەگەکە هات!

منیش بە خۆم و بەردەکەمەوە لە جێگەیەکی خۆمدا ڕەق بووم و بینیم چۆن سەگێکی ڕەش و گەورە بە هەڵەداوان بەرەو ڕووم دێت. قۆڵە بەرزکراوەکەم بە ئاسمانەوە ڕەق بوو، هاوارم لە دەمدا خنکا، پێیەکانم لە دوم نەدەهاتن و هەر ئەوەندەم لە دەست هات لە قەپۆزی داچەقاو و هەناسەسواریی سەگەکە بڕوانم و ئەویش خۆی بۆ هەڵدام و

خستمی به ئەرزدا. تەنیا شتێک کە هەستم پێ کرد، بەر لەوەی هەموو شتێک لەبەر چاوم تاریک بێت، بۆگەنی هەناسەی بوو.

کاتێک خەبەرم بووەوە کچەکان هەموو لە دەورم کۆ بووبوونەوە. کە هەستامە سەر پێش، (ئێدیت)، وەک ئەوەی هەست بە تاوانێک بکات، لێم هاتە پێشەوە و وتی: هیچ نییە! سەگەکەش ویستی یاریت لەگەڵدا بکات، ڕێک وەک ئەوەی کە من ویستم یاریت لەگەڵدا بکەم، کاتێک کە لە پێش تۆوە لە دارستانەکەوە ڕامکرد! و ئەو خوێنەی سڕییەوە، کە بە چڕنووکەکانی سەگەکە لە نێوچەوانم هاتبوو. پاشان وتی: قەیناکە! کۆلارەکەی خۆمت دەدەمێ و ئەوجا هەموومان بەرەو ئەو داربەڕووە گەورەیە ڕامانکرد، کە لەنێو چڵوپۆپەکانیدا کۆلارەکانمان شاردبووەوە. کۆلارەکەی منیش ئەوەیان بوو کە لە هەموو ئەوانی دیکە زیاتر بە هەوادا بەرز دەبووەوە، تەنانەت هەندێ جار بۆ چەند دەقیقەیەک پشت هەوران دەکەوت و لە چاو ون دەبوو.

***(ئێدیت)*** تەنیا کچێک بوو کە دەیوێرا ئاوڕ بداتەوە و سەیری ئەو پیاوە بکات کە بە دەست ئیشارەتی سەیر سەیری بۆ دەکردین و لەسەر ڕێگا سەرەکییەکە دەوەستا و دەستی دەکرد بە میزکردن. تەنیا کچێک بوو کە دەیوێرا پێی پێ بکەنێت، کاتێک بەرەو دارستانەکە دوامان دەکەوت. تەنیا کچێکیش بوو کە دەیوێرا ئەو شۆکولاتە وەربگرێت کە دەیدایەنێ، لە بەرانبەر ئەوەدا کە داوای لێ دەکردین نەختێکی لێ بدەین و کاتێک لە ناوی منیشی پرسی، هەر (ئێدیت) بوو وەڵامی دایەوە. بەڵام وتی: ناوی (کارلا)یە و نەک خوشکێ.

ئەویش وتی: ناوێکی چەند خۆشە! و ویستی دەست بە ڕوومەتمدا بهێنێت. کچەکان هاواریان لێ کردم: نەهێڵیت... وریا بە! و ئەوجا بە دەنگی تاساو و تۆقیوەوە بەرەو دارستانەکە هەڵهاتن. منیش بە ترس و لەرزەوە بە دوایاندا کەوتمە ڕاکردن، بەڵام بۆ بەدبەختی پێیان نەگەیشتمەوە و هەر ئەوەندەم پێ کرا بە تەنیا و هەڵەداوان دەرباز بم. پیاوەکەش بە دوامدا ڕایدەکرد و هەر نەیدەبڕیەوە و، یەک لە دوای یەک، بانگی دەکردم: کارلا! هەندێ جار پێم وا بوو هێندە لێم نزیک بووەتەوە کە دەتوانم دەنگی چەمانەوەی ئەو دەوەنانە ببیستم کە بە لایاندا تێدەپەڕی و، منیش وەکوو شێتێک بەناو دەوەنە تووترکەکانی نێو دارستانەکەدا، کە قۆڵ و قاچوقولیان دەڕوشاندم و خوێنیان لێ دەهێنان، ڕامدەکرد و ڕامدەکرد و قیژەقیژ و هاوارم باڵندەکانی دەترساند و زیقەزیقی باڵندەکانیش هێندەی تر منیان دەتۆقاند. تەنانەت ئەو کاتەش کە لەوە تێگەیشتم کە ئیتر دەستی لەوە هەڵگرتووە بە دوامدا ڕابکات، من هەر بەردەوام بووم و تا نەکەوتمە باوەشی پیرەژنێکەوە کە لەو ناوە تووترکی

دەچنییـیـەوە، لـە ڕاکـردن نـەکـەوتم. بەدەم گـریانەوە پـڕم بە جلەکـانیـدا کـرد. پیـرەژنەکـە سـەبەتەکـەی لە دەست کـەوتە خـوارەوە و دەسـتی کـرد بە شـیـرەشـیـر بەسـەرمدا. منیش لەتاودا دەسـتم بـە ڕاکـردن کـردەوە و بێ ئـەوەی بزانم چۆن و بە چ شێـوەیەک، گەیشـتـمـەوە ماڵەوە. لە مـاڵەوەش چەندیان ڕاوەشـاندم فـایدەی نەبـوو، هیـچ لێکدانەوەیەکم بـۆ ئەو حـاڵەتە بە دەستەوە نەبوو و ئـەوانیش ناچار هەڵیانگرتم و خستمیانە جێگاوە.

بۆ سـبـەی پۆلیس هـات و دەیانویست پێـیـان بڵـێم ڕەنگ و ڕووی ئەو پیـاوەی لە دارسـتـانەکـەدا دیبـووم چۆن بوو، بەڵام هیـچیـان لە قسـەکانم هەڵنەکرِاند و سـەریان لێ ڕادەوەشـاندم و حـــاڵی نەدەبوون و ناچار وتیـــان: با چاوەڕێ بکـەین، تا (ئێدیت) لای دۆکتۆر دێتەوە!

ڕۆژانی دوایی گشت کون و قوژبنێک پڕ بووبوون لە کچان و بە چپەچپ و حیلکەحیلکەوە بۆ یەکتر دەدوان. کە من لێیان نزیک دەبـوومـەوە، دەمـودەست بێ دەنگ دەبوون و بـەو جـۆرە تێیـان دەگەیاندم کە وا بـاشـترە لێیـان دوور بکەمـەوە و لەبەر چاویان ون بم. بەڵام شـەوێک لە شـەوان نـهـێنیـیـەکـەیانم هەڵهێنا و ئیـتر لەوساوە لەوە تێگەیشـتم کە ئیـتر نابێت زات بدەمە بەر خۆم و بە تەنیا بەنێو دارستاندا بڕۆم.

بـەڵام، تـا مـــــاوەیەکی دووروودرێـژیش، بـووبـوو بـە چـەقـی باسـوخـواسی کچـەکان و کـاتێکیش لێیان دەپرسی کە ئاخـۆ هیچ ترس و بیمێکی بەرانبەر بەو پیاوە تێدا ماوە و ئەویش بە سـەرووەرییـەوە سـەری لێ با دەدان و دەیوت: زۆر زۆریش ترسـناک نەبـوو! لەوەش ناترسـم دیسـانەوە بە تەنیـا بـەنێـو دارستاندا بڕۆمەوە.

***پێیان وتم***: تۆ نابێت ئاوها بیت بەرانبەر (ئێدیت)! ئەگەر وا بکەیت، دوو هەفتە لە گریان دەدا و نایبڕێتەوە. منیش دەبەنگ و بێشەرمانە لچم لێ با دەدان. بیرم دەکردەوە، بۆ نا! دەتوانم چۆنم بوویت ئاوا بم لەگەڵیدا! بیرم بە لای ئەوەدا چوو ئەو دوو بووکۆکەیەی پێشووتر دابووم پێی، لێی بسێنمەوە. (ئێدیت) تاکە کچێک بوو کە لە خانەی منداڵانەکەدا لە گشت کچان زیاتر خۆشم دەویست. کە دڵتەنگ و خەمبار دەبووم، هەر ئەو بوو پەنای دەدام، دڵی دەدامەوە و دەیهێنامەوە پێکەنین. بەڵام بۆ سبەینێ ئیتر ئەو دەبرا بۆ قبووڵکردن لە کڵێسا و پاشان سەفەری دەکرد و بۆ یەکجارەکی بە تەنیا بە جێی دەهێشتم. بە بڕیاری تەواوەوە و بێ هیچ ئەمسەر و ئەوسەرێک بووکۆکەکانم لە دۆڵابەکەی دەرهێنا و لە باخچەکەدا لە گۆڕم نان.

کە لە کڵێسا گەڕایەوە، بە ڕاکردن بەرەو لای بوومەوە و باسوخواسی لەگۆڕنانی بووکۆکەکانم بۆ گێڕایەوە و هاوکاتیش بە نارەحەتییەوە سەرنجم لە دەموچاوی دەدا تا بزانم ئاخۆ دەست بە گریان دەکات یان نا، بەڵام ئەو بە پێکەنینەوە ڕووی لێ وەرگێڕام و پشتی تێ کردم و بۆ سبەی بەیانیش بەرەو دنیای گەورەکان بە ڕێ کەوتبوو.

ئەوە من بووم کە بۆ ماوەی دوو هەفتان لە گریانم دا و ژیر نەبوومەوە.

***تەنیا من بووم*** کە نەمدەموێرا بەسەر چاڵەگەورەکەدا باز بدەم. لە ئاوە ڕەشە قوڕاوییەکەی دەترسام کە پێدەچوو بیەوێت بەرەو قووڵاییەکەی خۆی ڕاپێچم بکات، قووڵاییەک، کە کچەکانی تر، جار لەدوای جار، بە بازدانێکی پڕ لە پێکەنینەوە، لەکاتێکدا من بەشەرمەزارییەوە و بە پێچەبەدەورەیەکی فراوان خۆمم لێ دەدزییەوە، بەسەریدا زاڵ دەبوون.

بەڵام ئەمڕۆ بڕیارم دابوو هەوڵێک بدەم و بازم دا. باز کورتی هێنا و کەوتمە قووڵایی چاڵەکەوە، بەدەم هاوار و قیژەقیژەوە خۆم بە پەلکی چەند گژ و گیایەکی قەراغەکەیەوە گرتەوە. کچەکان باسکیان گرتم و دەستیان کرد بە ڕاکێشانم و منیش هێندە ترسا بووم کە نەمدەتوانی هیچ هاریکارییەکیان بکەم، پێشم وابوو کە تا بێت زیاتر بەرەو قووڵایی ڕۆ دەچم. لەپڕێکدا، گوێم لە دەنگی پێکەنینی یەکێک لە کچەکان بوو. هێند سەرسام بووم و ئەو پێکەنینە نابەجێیە هێندە کاری تێکردم کە ترسەکەی خۆمم لە بیر چووەوە، ئیدی بۆ کچەکان ئاسانتر بوو پەلکێشم بکەن و لە چاڵەکە دەرم بهێنن.

لەوساوە چیتر لە چاڵەکە نەدەترسام، بەڵام لەبری ئەوە لە شتێکی تر دەترسام: پێکەنینی بێمانا.

بە کاوەخۆ دەرگای ژووری سەرپەرشتکارەکەمانم داخست و بە سەری نەوییەوە بە بەردەم ئەو سەروسیمایانەدا کە چاویان تێبڕیبووم و لەوەیان دەپرسی کە ئاخۆ بۆچی بۆ ئەوێ بانگ کراوم، تێپەڕیم.

دەمویست تاک و تەنیا و بێ شەریک لەگەڵ حاڵەتە تازەکەمدا بمێنمەوە. بیر بکەرەوە ئەگەر منیش دایکێکم هەبووایە و لە سبەی درەنگتریش نا بهاتایە، بۆ خانەی منداڵانەکە، بۆ دیدەنیم!

ئاخـرێکەی خـەون و خـەیاڵاتەکـانم هاتنە دی. ئاخـۆ چەند جـاران، ئێـمـە منداڵانی خـانەی منداڵان، لەبارەی دایک و باوکـمـانەوە خـەون و خـەیاڵاتمان نـەدەکـردەوە و چیـرۆک و داسـتـانی جـوان و دڵڕفـێنمـان لـەبارەوە دروست نەدەکـرن! پێـشـتـر، دایک و باوکی هەندێک لە کـچـەکـان، هاتبـوون بۆ سەردانیان و هەمیشە دوای ڕۆیشتنی ئەوانیش دەستیان بە گێڕانەوەی ئەو باسوخـواس و شتـە خۆشانە دەکرد کە لەگەڵ دایک و باوکـیان بینیـبوویانن و دڵائارا لەو شیـرینییـانەیان دەبەخـشـیـیـەوە کـە وەریانـگرتبـوون و منداڵانـی گـوێقـوڵاغی دەوروبەریشیان تا دەهات زیاتر و زیاتر دەبوون. من هـەمیشە لەو کاتانەدا حەسـوودیم پێ دەبردن و دڵ پڕ لە دەرد و کۆڤان و دوور لەوان، خـۆم لە پەنایەکـدا لاتەریک دەکـرد و لە هەمـوو کاتێکیش زیاتر هەستم بە تەنیایی خۆم دەکرد.

بەڵام ئێستا ئیتر ئەستێرەی بەختی منیش داگیرسابوو. سـبـەینێ دایکم دێت بۆ دیدەنیم، دایکێک کـە تا ئەو کـاتە لە بوونی بێئاگا بووم. ئەو شەوە تا بەیانی نەمتوانی بنووم. ئاخر زۆر شت هەبوون بیـریان لێ بکەمـەوە. لـە چی دەچوو! ڕەنگ و ڕووی چۆن بـوو؟ هـیـوادار بـووم کـە زۆر قـەڵەو بێت و ڕوومـەتەکانیشی سـوور و ئاڵ بن. کـەسێک بۆی گێڕابوومـەوە کـە دایکێکی ڕاسـتـەقـینە دەبێت قـەڵەو و ڕوومـەتئـاڵ بێت، هـیـواداریش بووم دەست بنێـمـە نێو دەسـتـیـەوە و پێی بڵـێم: دایە. لەبەرخـۆمـەوە دەمـوتەوە: دایە، هەسـتێکی خـۆش، بەڵام هاوکاتیش ترسناک بوو. لە دڵیشەوە بە هیوا بووم، منداڵانی دێیەکە، کە هەمیشە خۆیان لە ئێمەی منداڵانی خانەی منداڵان بەرزتر دەبینی و جوێنیان پێ دەداین، لەگەڵ دایکمدا بمبینن و دەست بە پرس و ڕا بکەن. بێگومـان، دیاری و شـیـرینیـشی

لەگــەڵ خــۆیدا هـێناوە تـا بتــوانم بـەســەر کــچــەکــانـی تردا دابەشیان بکەم و پرس و ڕاکانیان بوروژێنم.
ســبــەینێی قــەشــەنگ و پرشنگدار هات. ئـەو کـراســەی یەکــشـــەممان لە بەرم دەکــرد، شــاد و خــەنی بە ڕوومــدا دەدرەوشـایەوە. یەکـێک لە کـچـە گـەورەکـان یارمـەتیـدام و جلەکـانی لە بەر کـردم. قـژی کردم بە دوو پرچی لاسار، کـە ڕەپ و ڕاست لە هەوادا ڕاوەستا بوون. پاشان بە تەنیا بەرەو ڕێگا سـەرەکیـیەکە بە ڕێ کرام، ئەو ڕێگایەی هەمـیشـە لێی دەسڵەمیمەوە و لێی دەترسام.
زۆر دوور نەکـەوتبـوومـەوە و نەڕۆیشـبـووم کـە هەسـتم بە نادڵنیـایی و ترس کرد. چۆن بتـوانم دایکم بناسمـەوە؟ بڵـێی لێم نزیک بێتـەوە و، لەکاتێکدا بەو جۆرە دەهـاتمە پێش چاو، بیـەوێت دەسـتم تێـوە بدات؟ بە ڕقـەوە چاوم بەرەو پرچەکـانم دەگێڕا و ڕێک لەو کاتەدا کـە خەریک بوو بیانکەمەوە، چاوم بە ژنێک کـەوت بەرەو ڕووم دەهات. ناشـێت ئـەوە دایکم بێت، ئەو ژنە قەشـەنگە ڕەنگزەردەی لە پێشمـدا ڕاوەستابوو، نـاشێت!! بەڵام هاوکات هەستم کـرد کە دەبێت ئەو بێت. جلێکی ڕەشـی پۆشـیـبـوو، خـۆریش لەنێـو قـژە بۆ سـەرەوە هەڵدراوەکـەیدا ئاڵتوونی دەڕست.
ڕۆژباش، کـچـە بچکۆلەکـەم! پێی وتم و دەســتــە نەرمــە سپییەکی بە ڕوومەتمدا هێنا. هێندە جوان بوو هەر مەپرسە! کتومت وەک گوڵەباخەکەی نێو باخچەکەی خانەی منداڵانیش بۆنێکی ســـەیر و قـــورسـی لێ دەهـات. بە ڕێزەوە خـــۆم بۆ چەمـاندەوە، بەڵام نـەمـتـوانی هیچ بڵـێم. بە کـەمێک شـەرمـەوە بیرم لەوە کردەوە: دایک وایە!!
دەســتی نەگـرتم. لە تەنیـشت یەکــتــرەوە ڕێمـان دەکـرد.

لەبارەی خانەی منداڵانەوە لێی پرسیم و منیش تەنیا بە چەند وشەیەک و بە کزیەوە وەڵامم دەدایەوە. دەترسام. لە دنیا نامۆ و جوانەکەی دەترسام. بیر و خەیاڵاتم هەر لای ئەوە بوو کە هەرگیزاوهەرگیز نەوێرم بتوانم بە دایک بانگی بکەم. بە دزییەوە سەیری جانتاکەی دەستیم کرد. بچووک بوو، دڵنیا بووم هیچ پاکەت و دیارییەکی تێدا نییە. دوو دڵۆپ کەوتنە سەر جانتا بریسکەدارەکەی. سەیرم کرد، دەگریا.

بەسەزمان! بەسەزمان! ئەمەی وت و منیش یەکسەر دەستم بە گریان کرد و ویستم بەرەو ماڵ ڕابکەمەوە. بەڵام ئەو هاتبووەوە سەر خۆی و بە دەنگێکی کەمێک پشێوەوە وتی: وەرە، با بچین شتێکت بۆ بکڕین. بەڵام من ئارەزووی ئەوەم نەکرد. کەواتە با بچینە باخەکەوە و، بە پێکەنینەوە وتی و بۆ یەکەمجار دەستی گرتم. بەڵام دەستم لەنێو دەستەکانیدا ناڕەحەت بوو. گیرامە دواوە. ئاخێکی هەڵکێشا و وتی: چیت لەگەڵدا بکەم، ڕۆڵە؟ دیارە حەز لە چارەم ناکەیت؟ ئاوێنەیەکی دەرهێنا و دەموچاوی بۆدرە کرد. زۆر جوانیت، بەنزمییەکەوە ئەمەم وت و دەستم نایەوە نێو دەستی. ئەویش پێکەنی و نێوچەوانی ماچ کردم.

ئێستا ئیتر نێوانمان ئاسایی بووبووەوە. شانازیم پێوە دەکرد. با بچین لەسەر ئەو کورسییەی ئەولاوە دانیشین و، دەستی بۆ کورسییەک ڕاکێشا کە پیاوێک لەسەری دانیشتبوو. لێم پرسی ئاخۆ ناتوانین لەسەر کورسییەکی چۆڵ کە کەسی تری لێ نەبێت، دابنیشین! دەمویست هەر بە تەنیا بۆ خۆم بێت. سەری ڕاوەشاند و وتی: وەرە، با بچینە ئەوێ.

پیاوەکە، یەکسەر، دەستی بە قسەکردن کرد لەگەڵماندا و هەردووکمانی هێنایە پێکەنین. لە باوەشی گرتم و وتی: دڵنیام

کــە تۆش وەک دایکت جــوان دەبیت!، بەخـــتـــیـــار بووم. بۆ یەکەمجار هەستم بە نزیکی کرد لە کەسێکەوە. بەڵام هەرزوو لە بیریان کردم و منیش بە ڕقەوە چاوم بە پیاوەکەدا گێڕا، پێم وابوو زۆر سەیر لە دایکم دەنوارێت. بە پێداگرتنەوە پێم وتن: دەمەوێت بڕۆم! ڕۆیشتین. دڵشاد و خەنی لەنێویاندا هەڵدەقونامەوە. بێگومان، کاتێک دەگەینە سەر ڕێگاکەی خانەی منداڵان، پیاوەکە، بە جێمان دەهێڵێت و ئیتر دایکم بە تەنیا هەر بۆ خۆم دەمێنێتەوە و پیشانی کچەکانی دەدەم. ئەوە گرنگ نەبوو کە هیچ دیارییەکی پێ نەبوو. ئاخر هێندە جوان بوو بەشی هەموو شتێکی دەکرد.

بەڵام کاتێک گەیشتینە سەر ئەو لاڕێیەی دەکەوتە سەر ڕێگا سەرەکییەکە، دەستی بۆ درێژ کردم و ماڵئاوایی لێ کردم. بێ ئەوەی لە هیچ تێ بگەم، چاوم تێ بڕیبوو. نەمتوانی دەستی بۆ بەرز بکەمەوە و خواحافیزی لێ بکەم. چیتە! بڕۆ بۆ ماڵەوە! ئیتر بە پێکەنینەوە قۆڵی بە قۆڵی پیاوەکەدا کرد، پشتی تێ کردم و ڕۆیشتن. وەک ئیفلیجێک، بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ، لە جێی خۆمدا مامەوە و لە پشتەوە سەیرم دەکرد. تەنانەت ئاوڕێکیشی لێ نەدامەوە.

وەک بەنجکراوێک بەرەو ماڵ گەڕامەوە. منداڵەکان بە پرسیارکردن هەڵیانکوتایە سەرم. نائومێدی ڕەنگ و ڕووی پەڕاندبووم و دەستەکانیشم بەتاڵ. کچێکیان دەستی کرد بە گاڵتەپێکردنم. بە ڕاکردن لە دەستیان هەڵهاتم و بەدەم لووشکەلووشک و گریانەوە خۆم لەنێو باخچەکەدا شاردەوە.

ڕقم لێتانە، ڕقم لە هەموو گەورەکانە! قیژاندم و پەنجەکانم بە قووڵی لە خۆڵەکەی بەردەمم چەقاند.

دە ساڵ دوای ئەوە، بۆم دەرکەوت کە ئەو پیاوە باوکم بوو.

***ڕۆژێکیان*** سەرپەرشتیارەکەمان بە خۆشییەکەوە پێی وتم: خوشکێ! ئێستا کە ئیتر بۆ هۆڵی نووستنی کچە گەورەکان دەگوێزیەوە و دەست بە قوتابخانەش دەکەیت، ئیتر بوویت بە کچێکی گەورە و ئێمەش دەبێت دەست لەوە هەڵگرین بە خوشکێ ناوت ببەین و دەبێت بە ناوی ڕاستەقینەی خۆتەوە، بانگت بکەین: کارلا.

بەڵام من نەمدەویست ببم بە کچێکی گەورە! نەمدەویست بۆ هۆڵی نووستنی کچە گەورەکان بگوێزمەوە! نەمدەویست دەست بە قوتابخانە بکەم! نەمدەویست ناوم کارلا بێت! بە کەللەڕەقییەوە خۆم لەو ناوە دەپاراست. دەمویست لە سای نازناوی (خوشکێ)دا بەردەوام بم و خەون ببینم.

یەکەم شتێک کە لە قوتابخانە فێری بووین نووسینی ناوی خۆمان بوو. بێگوێیم کرد و نەمویست بنووسم: کارلا و لەبری ئەوە نووسیم: خوشکێ. وەک سزایەک لە ڕیزی پشتی پشتەوە دانام. دەفتەرێک خرایە بەر دەمم. دەبوو پێنج لاپەڕەی بە ناوی کارلا ڕەش بکەمەوە. لە یەکەم (کـ) زیاترم بۆ نەنووسرا. پاشان هەستم بە نارەحەتی کرد و دەستم بە گریان کرد. ئاخرێکەی وازیان لێ هێنام و چ لە ماڵەوە و چ لە قوتابخانەش وەکوو (خوشکێ) مامەوە و هەر بە خوشکێ بانگیان دەکردم.

هەمیشە، کاتێک کە دەمبیست نەنکم بۆ سەردانم دێت، ترس و خەمێنی دایدەگرتم. ئەو تەنیا خزمێکم بوو کە جارجارە و بەڵام بەردەوام سەردانی دەکردم. حەزم لە نزیکبوونەوەی نەدەکرد و هەمیشە هەستێکی وای دەدامێ کە هەست بە نادڵنیایی بکەم، بۆیە هەردەم بە نابەدڵییەوە دەچووم و پێشوازیم لێ دەکرد.

هەمیشە بە دەنگی بەرز هاواری دەکرد: ڕۆژباش، کارلای بچکۆلانە، ڕۆژباش! و لەشە قەبە و نامۆکەشی بەسەردا دەچەماندمەوە بۆ ئەوەی ماچم بکات. بە خۆشییەوە لەگەڵ خۆیدا بۆ پیاسەی دوورودرێژی دەبرم و تا لە خانەی مندالانەکەشمان دوورتر بکەوتینایەتەوە زیاتر هەستم بە نادڵنیایی دەکرد. جارێکیان لێم پرسی کە کێ ناوی ناوم کارلا. وەڵامی دایەوە: من و دایکت. لێم پرسی: بەڵام ئەی بۆ ئەو ناوە ناشیرینەتان لێ ناوم؟ بۆی باس کردم: باوکت ناوی (کارل)ە و ئێمەش تۆمان بە ناوی ئەوەوە ناو ناوە. بە سەرسامییەوە لێم پرسی: باوکم هەیە؟ ئەوە یەکەم جار بوو لە بارەی باوکمەوە ببیستم. ئەی لە کوێیە، بۆ نایەت بۆ ئێرە بۆ لام؟ نەنکم بە کورتی وەڵامی دامەوە: ئاخر کاتی نییە! بەڵام من دەمەوێت بێت بۆ لام، دەمەوێت بێت و ناوێکی ترم لێ بنێت. نەنکم، بەر لەوەی خۆی لەنێو دەوەنەکاندا ون بکات، وەڵامی دامەوە: باوکت هیچ هەقێکی بەسەر تۆوە نییە.

بە لۆمە و سەرزەنشتەوە چاوم تێ بڕی و بیرم کردەوە: ئاوها! باوکم هیچ هەقی بەسەر منەوە نییە! ڕقم لێی دەبووەوە، چونکە وایوت. بینم چۆن تەنوورەکەی هەڵکێشا و لەنێو دەوەنەکەدا ڕانە ڕووتوقووتەکانی دەرکەوتن. قێزم لێی دەبووەوە و بەرەو ماڵەوە ڕامکرد. بیرم کردەوە: نابێت قەت جارێکی تر میز بکەم و، توانیشم بە درێژایی ڕۆژێک خۆم بگرم و میز نەکەم. لە ناخی خۆمدا دەمچڕی: قەت نابێت بهێڵم گەورە بم، قەتیش نابێت ناوی کارلا بە هیچ بزانم!

***سەگ*** *هاوتوخمی* گورگە و، گورگیش *سەرسەختترین* دوژمنی مرۆڤ، بەڵام بە *پێچەوانەی* گورگەوە، *سەگ* چاکترین *هاوڕێی* مرۆڤە و *زۆربەی جاران بە ئاشتی و تەبایی لەگەڵ مرۆڤدا* دەژی. *سەگ* گۆشت دەخوات، بەڵام *جارنا* دەبنیرێت گیاش دەخوات، ئەوکات *خەڵکی بەیەکتر دەڵێن: قەدەرێکی تر باران* دەبارێت.

ئەم دێڕانە، چەندانێک بوون لەو دێڕانەی لە یەکەم کتێبی قوتابخانەوە فێریان بووم، بەڵام یارمەتییان نەدام بەسەر ئەو ترسەدا زاڵ بم کە بەرانبەر بە سەگم هەبوو. چەند زیاتر ئەم دێڕەم لەبەر خۆمەوە دەوتەوە: *سەگ چاکترین هاوڕێی مرۆڤە،* لەگەڵ ئەوەشدا بە تەواوی دەترسام کاتێک بەو هاوڕێ نزیک و چاکەی مرۆڤ دەگەیشتم. هەندێک جار، کەمێک، بەسەر ترسەکەمدا زاڵ دەبووم و، کاتێک ڕووبەڕووی دەبوومەوە، سیمام وەرنەدەگێڕا و خۆم نەبان نەدەکرد، بەڵام هەمیشە لە نزیکەوە هەستم بە ئامادەیی سەگەکە دەکرد و سەراپام دەکەوتە لەرزین. زۆرجاران ترس ڕەقی دەکردم، لەپڕێکدا دەوەستام و بە چاوی پڕ لە نیگەرانییەوە چاوم تێدەبڕی. ئەم سەیرکردنە لە ناخەوە سەگەکەی دەجووڵاند و، وا پێدەچوو ترسەکە ئەویش دابگرێت و، بەڕقەوە دەستی لێ دەکردم بە مرەمر، کاتێکیش ڕامدەکرد، بە دوامدا ڕایدەکرد و هەردووکمان هەمان ترس، تا ئەو کاتەی گەورەیەک بانگی لێ دەکرد، ڕاوی دەنام. ئەوسا، بە هێواشی و لووشکەلووشک و شەرمەزارییەوە دەکەوتمەوە ڕێ، بێ ئەوەی لەوە تێبگەم بۆ بەو جۆرە ترسابووم، چونکە ئەو کاتە سەگەکە تەواو خۆی لێ نەبان کردبووم و بە کلکەلەقێ لە دەوری خاوەنەکەی دەگەڕا. وا پێدەچێت هەرگیز فێر نەبم لەگەڵ چاکترین *هاوڕێی* مرۆڤدا بژیم.

***ڕەشیلە!***× ڕەشیلە! تا دڵ بیخوازێت تاسەی خواردنی ڕەشیلەم دەکرد. هەموو شەوێک بەر لە خەوتن، دەنک دەنک، لە پێش چاومدا قووت دەبوونەوە. ڕەشیلە: ئەو خۆرە ڕەش و خڕیلانەی، کاتێک کە بە لایاندا ڕەت دەبووین، هەمیشە بە نەرمونیانی و شادییەوە بە ڕووماندا دەدرەوشانەوە. ئەوانەی لە بیلبیلەی پڕ لە خەندەی چاوان دەچوون، ئەوانەی وەکوو مرواریی نێو ئەو ملوانکە لە گوڵ چنراوە وا بوون کە قەشە لە ملی دەکرد و کاتێک دەتخستنە دەمتەوە، وەکوو ماچ ــ سوور و گەرم ــ لەنێو دەمدا دەتوانەوە.

بێگومان، بۆ ئێمەی منداڵانی خانەی مامۆستایان، یاساغ بوو لەو ڕەشیلانە بخۆین. ئەمەمان باش دەزانی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە سێ کچ بووین و بەیانییەکی یەکشەممە خۆمان دزییەوە تا بچین لێیان بکەینەوە. خۆر، وەک ئەوەی بیەوێت ڕازەکەمان ئاشکرا بکات، دنیای تەواو ڕۆشن کردبووەوە. بە ترس و دڵەڕاوکەوە خۆمان بە دیوارە ڕووتوقووتەکەوە نووساندبوو و پێمان وابوو دەموچاوەکان لە گشت پەنجەرەکانەوە تێمان دەڕوانن. بەڵام هەر ئەوەندەی بێدەنگی ئەو ناوەی داگرت و ئەو خۆرە ڕەش و گەرمانەش خۆیان بە ڕوودا کردبووینەوە و تێیان دەڕوانین، گوڕمان دایە بەر خۆمان و هێندەی نەبرد هەریەکەمان خۆی لە قووڵایی دەوەنێکدا شاردەوە. کەمێک، بەبێ ئەوەی بوێرین پەنجەیەک چییە بجووڵێنین، لەوێدا دانیشتین، بەڵام بۆن و بەرامەی ئەو بەرە قورسانە هێوریان کردینەوە و دەستمان بە چنینەوەی کرد.

× ڕەشیلە لە بەرانبەر *svartvinbär (black currant)* دانراوە. بەری دەوەنێکە، مزر و ڕەشە و لە بەرسیلە دەچێت.

سەرەتا، بەوپەڕی وریاییەوە، دوو دەنکم لێ کردەوە. لەسەر لەپی دەستم دامنان. ڕامدەژەندن و لە دوو فرمێسکی ڕەش دەچوون کە جۆرە خەندەیەک ڕووناکی کردبنەوە. گەورەترینیانم خستە دەممەوە، بە هێواشی، وەکوو ئەو ماچەی دایکم کە هەمیشە، شەوانە، پێش نووستن، خەونم پێوە دەبینی؛ لەنێو دەممدا توایەوە. دەنکێکی تریشم خستە دەممەوە، پاشانیش دەنکێکی تر و دەنکێکی تر و هێندەی نەبرد ئارەزووی خواردنیان هەموو شتێکی تری لە بیر بردمەوە. هەر لێم دەکردنەوە و دەمچنینەوە تا بە تەواوی بەو خۆرە ڕەشانە سەرمەست بووم.

هەرسێکمان هێندەمان لێ کردەوە، تا دەوەنەکان ڕووت بوونەوە. پاشان، نەختێک شەرمەزار، نەختێک ناڕەحەت و نەختێکش بە ترس و لەرز، بەرەو ماڵ بووینەوە.

بە درێژایی ئەو ڕۆژەش چاوەڕوانی ئەوە بووین ئاشکرا بین و بە سزای خۆمان بگەین. دڵنیا بووین لەوەی کە هەروا بە ئاسانی نەجاتمان نابێت. دڵخۆشیمان بەرانبەر بەو ڕەشیلانە بە تەواوی لە بیر کردبوو. بۆ ئێوارە بانگ کراین و وەکوو ئەوەی بارێکمان لە کۆڵ بووبێتەوە وا بوو. کاتێک ئەوانی تر لە ژوورەوە بوون، من لە دەرەوە ڕاوەستا بووم و چاوەڕوانی نۆرەی خۆم بووم. لەپڕێکدا گوێم لە گریە و قیژە بوو. لە جێی خۆم ڕەق بووم. ئێستا نا نەختێکی تر منیش بیراز دەکرێم. هەستم کرد لە شەرمەزاریدا سوور هەڵگەڕاوم. بە چرپە و بە دانەجیڕەوە وتم: دەستم لێ بدەن، دەیانکوژم! کە هاتن بۆ ئەوەی بمبەن، بەسەریاندا قیژاندم کە من ڕەشیلەم لێ نەکردووەتەوە و ئەوانیش هیچ هەقێکیان نییە دەستم بۆ بەرن. بیراز نەکرام. زۆر سەیریش بوو.

کە دوو دەستەخوشکەکەمم بە چاوی سوور و گریاو و جێی شینەوەبووی لێدانەوە بینییەوە، شەرمەزاری دایگرتم و بە پەلە بەرەو لای مامۆستاکەم خۆم کرد بە ژووردا و پێم وت کە منیش لەو ڕەشیلانەم خواردووە. بەڵام لەوە دەچوو ئەو هەموو شتێکی لە بیر کردبێت. لەبەر ئەوە سزا نەدرام. بەر لەوەی چاوم بچێتە خەو، وەک ئەوەی بە چڵوچێوی دەم ئاوانەوە گیرسابمەوە، حاڵم ناحاڵ و نائارام بوو.

بۆ شەوێ خەونم بە پیرەژنێکی ڕووخۆشەوە بینی، کە سەبەتەیەکی پڕ لە ڕەشیلەی بۆ ڕاگرتبووم. بەڵام تا توانیم بە ترس و لەرزەوە لێی هەڵهاتم.

*Herligt, en sommerdag*
*drage til elverkrat,*
*hvile ved kilden den svale!*

***لەکاتێکدا*** بەرەو کەناری دەریاکە بە ڕێ کەتبووین و بە خۆشییەوە خاولییەکانمان وەک چارۆکەی بچکۆلە بچکۆلە لەنێو قۆڵە هەڵبڕاوەکانماندا دابووە بەر با، ئەم گۆرانییەمان دەوت و ڕێگا سەرەکییەکەمان دەگرتە بەر، ئەو ڕێگایەی کە پەلکی گەنم و جۆی نێو کێڵگەکانی ئەمبەر و ئەوبەری کەروێشکەیان دەکرد و پڕ بوون لەو گوڵاڵەسوورە و گوڵانەی کە بە سەرە شین و سوورە بچکۆلەکانیانەوە سەریان بۆ دانەواندبووین، پاشان کەوتینە نێو دۆڵی سەوزی دارستانێکەوە کە درەختەکانی بەسەر سەرماندا شۆڕ بووبوونەوە و بەنێویشیاندا پەڵەی سێبەر و هەتاو لەسەر نێوچەوانمان یەکتریان ڕاو دەنا، هەر دوا بە دوای ئەوەش لەسەر کەناری بە گرموهوڕی دەریاکە، کە بایەکانی وەکوو گیانلەبەری برسی دوابەیتی گۆرانییەکەی هەڵدەلووشین: ماڵئاوا، ماڵئاوا، بەم زووانە یەکتر دەبینینەوە، ماڵئاوا... سەرمان دەرهێنا و هەموو پێکەوە، دەم بە پێکەنین، بە سەماکردنەوە بەسەر تەختەی درێژکراوەی سەر کەنارەکەدا کە دەچوو نێو ئارامیی کوختەکانی خۆگۆڕینەوە خۆمان کرد بە کوختێکدا و بە خێرایی جلەکانمان لەبەر خۆمان داکەند و لەگەڵ دەنگی فیکەی مامۆستاکەماندا وەکوو باڵندەی تینوو خۆمان بەنێو دەریا فێنکەکەرەوەکەدا کرد.

من یەکەم جلی مالەم، کە زۆر دەمێک بوو بە تاسە و ئارەزووی ئەوەوە بووم پیشانی ئەوانی دیکەی بدەم، لەبەردا بوو؛ بەڵام هیچ خۆش نەبوو لە بەرمدا، بە لەشمەوە نووسابوو

و هەستیشم بە دەستوپێبەستراوی دەکرد. لە کاتێکدا کە کچەکانی تر بەوپەڕی خۆشییەوە و، بێ ئەوەی هیچ شتێک ڕێیان پێ بگرێت، خۆیان دابووە دەست مەلەکردن؛ من نابەدڵ و دڵتەنگ هەوڵم دەدا خۆم لەنێو پێستە تەڕەکەمدا بابدەم و کاتێکیش کە دەبوو لە ئاوەکە بێینەوە دەرەوە بۆ ئەوەی خۆمانی تێ فڕێ بدەینەوە، هێشتا من هەر لە ئاوەکەدا وەستا بووم و بە جلەکەمەوە خەریک بووم و، هێندەش پێوەی خەریک بووم لەوان دواکەوتم.

مامۆستاکەمان لەسەر ئەو تەختەیەی کە بەرەو ئاوەکە بە درێژی دانرابوو ڕاوەستا بوو و چاوەڕێی دەکردم. بەتوندی قۆڵی گرتم و کەوتە لێدانم، زۆر بە توندی و بە تووڕەییەوە لێی دام و منیش نەمدەزانی بۆ لێم دەدا.

لەشم بە پەنجە تووڕەکانی وەکوو پشکۆ داگیرسابوو و کچەکانیش بە گاڵتەوە پێم پێدەکەنین. هەستم بە شەرم و ڕق دەکرد. هێندە بە چڕوپڕی ڕقم لێ دەبووەوە کە دڵمی تێکەڵ دەهێنا. کاتێک بەرەو ماڵەوە گەڕاینەوە، تۆڵەی خۆم لە گوڵەکان سەندەوە. شەقم تێ هەڵدەدان و پێم پێدا دەنان و مامۆستاش هێندەی تر بیزاری کردم، بەڵام من نەمدەتوانی دەست هەڵگرم و هەر لەسەر شەقتێهەڵدان و پێپێدانانی گوڵەکان بەردەوام بووم و ئەویش، تا ئەو کاتەی قاقایەکی لەپڕ لە لێوەکانمەوە بەرز بوونەوە، دەستی لە لێدانم هەڵنەگرت. هەر ئەوساش هەردووکمان ترساین و ئیتر ئەو چیتر نەیوێرا لێم بدات.

یەکشەممەی جەژنی پینگست[×] و گەرمترین ڕۆژی ئەو

[×] پینگست، جەژنێکی ئایینیی گاورانە دەکەوێتە مانگی پێنج یان شەشی ساڵەوە.

هاوینە بوو. دوای گریە و پاڕانەوەیەکی زۆر، ئاخرییەکەی، ڕێم پێ درا کراسە سوورە تازەکەم، ئەوەی لە شارەوە بۆم نێردرابوو، لە بەر بکەم. کە بە ڕێ کەوتین، کچەکان بە حەسوودییەوە تەماشایان دەکردم، چونکە ئەوان جلوبەرگی ئاسایی خانەی منداڵانیان لەبەردا بوو، ئەو جلوبەرگانەی کە هێندە شۆردرابوون ڕەونەقیان لەبەر بڕابوو. بەڵام هەر ئەوەندە گەیشتینە دەرەوەی تخووبی خانەی منداڵانەکە، تۆڵەی خۆیان سەندەوە. سەرەتا لە دەوری یەک کۆ بوونەوە و کەوتنە چپەچپ، پاشان زۆر بە پەلە کەوتنە ڕێ، بە جۆرێک کە ناچار بووم بە لۆقەلۆق و ڕاکردن بکەومە دوایان. بە دوایاندا هاوارم دەکرد: چاوەڕێم بکەن! بەڵام ئەوان هەر پێدەکەنین و یەکێک لە کچە هەرەگەورەکان وتی: چاوەڕێ بە تا بە لای گاکەدا ڕەت دەبین، ئەوسا بە دڵنیاییەوە دەتوانیت ڕا بکەیت و هەستیش بەوە دەکەیت کە پۆشینی کراسی سوور چەندێ خۆشە! بە نیگەرانییەوە لێم پرسی: ئاخر لەبەر چی؟ وەڵامی دامەوە: کەللەپووت، نازانیت لەبەر چی؟ نازانیت کە گا ڕقیان لە سوور دەبێتەوە و پەلاماری هەرکەسێک دەدەن کە سووری لەبەردا بێت و بە شۆق شڕووڕی دەکەن. بە کزییەوە لێم پرسی: بە ڕاستیتە؟ وەڵامی دامەوە: دڵنیا بە. ئەی نەتبینیوە هەر هێندەی بەر دەبێت، چۆن دەنیشێتە سەر گوڵاڵەسوورەکان و پان و پلیشیان دەکاتەوە و پاشانیش دەیانخوات؟ چەند ڕۆژێک لەمەوبەر خۆم بینیم کە دەمی پڕ بووبوو لە گوڵاڵەسوورە و ڕۆژێکی تریش بینیم چۆن پەلاماری کچە شیرفرۆشەکەی دا، هەر لەبەر ئەوەی لەچکێکی سووری بەسەرەوە بوو. هەر لەبەر ئەوە لەو بڕوایەدام، هەر هێندەی گەیشتیتە ئاستی گاکە، لە ئاسایی پەلەتر پێی لێ دەکەیتە

هەوا و دەکەویتە ڕاکردن، چونکە دڵنیا بە لەوەی کە ئەو خۆی لەبەر بینینی کراسێکی هێندە سووردا ناگرێت. یان ئێوە دەڵێن چی؟ بەو پرسەوە ڕووی بەرەو کچەکانی تر وەرگێڕا و ئەوانیش هەموو یەکڕا سەریان بۆ ڕاوەشاند. قوڕگ پڕ لە گریان، لێم پرسی: ئەی ناتوانم ڕابکەمەوە ماڵەوە و کراسەکەم بگۆڕم! وەڵامی دامەوە: کەر بوویت! پێ هەڵگرە و پەلەمانە! با ببینین بزانین گاکە چی دەکات.

یەکێک لەوانی تر هاواری کرد: ئەوەتا! هەر ئەوساش گاکەمان بینی ئارام لەسەر ئەرزکە پاڵ کەوتبوو و کاوێژی دەکرد. ئەوەیان کە لە هەموویان زیاتر دەیویست ئەزیەتم بدات، هاواری کرد: تەماشاکە، ئەوەتا گوڵاڵەسوورەیەکی بە دەمەوەیە! ئاگاداریان کردمەوە: تەماشا، تەماشا، ئەوەتا سەیری تۆ دەکات! لەو کاتەدا گاکە سەری بەرز کردەوە و سەیری کردین. خێراکە با دەرباز بین! سەیرکە، ئەوەتا هەستایە سەر پێ! گاکە هەستایە سەر پێیان و بۆڕاندی. سەراسیمە و سەرگەردان بەر بوومە کراسە سوورەکەم تا لەبەر خۆمی دابکەنم، بەڵام هەر ئەوەندەم توانی یەک دوو تیلماسکی لێ دادڕم و تا ئەو کاتەش هیچ یەکێک لە کچەکان بە هانامەوە نەهات، بەڵام پاشان هەموویان وەک چادرێک خۆیان لە دەورم گرد کردەوە و زۆر دوور لە گاکەوە پاڵیان دام.

کە هاتینەوە ماڵەوە کچەکان گێڕایانەوە کە کراسەکەم لە چڵە تووترِکان گیربووە و دڕاوە و لەسەر ئەوەش تێهەڵدانێکی چاکم خوارد.

***بەیانیان***، هەندێ جار، لەشسووک و دەمبەپێکەنین لە خەو هەڵدەستاین، وەکوو زەمبەلەک لە جێگاکانمان دەردەپەڕین و بە کەیف و خۆشییەوە، لە کاتێکدا کە سەرگەرمی ئەو شەڕەدەمە بووین کێ زووتر خۆی بگەیەنێتە بەر شوێنی خۆشۆرینەکە، دەستمان دەکرد بە سەرین و خاولی هاویشتن بۆ یەکتری. هەر زووش هەموو خۆمان لەبەر ئاوەکەدا دەبینییەوە: ڕیزێک کچی بچکۆلانەی نیوەڕووت، سەر و قژ ئاڵۆسکاو و قنگ ڕووت و وەکوو بەچکە مەلی تینوو خۆمان لە ئاوە سارد و سازگارەکە هەڵدەکێشا، درزی بچکۆلانەی دەوری چاوەکانمان پڕ دەبوون لە خەندە و پێکەنین، گوپەکانمان پڕ لە ئاو دەکرد و ئاومان بە یەکتردا دەپرژاند و لە خۆشیاندا بەسەر یەکتردا دەمانقریشکاند، تا ئەو کاتەی گەورەیەک چەپڵەیەکی بۆ لێدەداین و ئیتر لەوە بە ئاگا دەهێنراینەوە کە کاتی خۆئامادەکردن و جللەبەرکردن هاتووە. جلەکانمان، بە تۆپەڵ تۆپەڵی بچووک، لەسەر ئەو کورسییانە دانرابوون، کە لە بەردەمی هەر جێگایەکدا قووت کرابوونەوە و بە خێرایی جلوبەرگمان دەپۆشی، گۆرەویمان لە پێ دەکرد و پانتۆڵمان هەڵدەکێشا. پاشان دەبوو قژمان دابهێنین، چونکە پرچەکانمان دوای هاروهاجیی شەو بەتەواوی ئاڵۆسکا بوون. کچە گەورەکان یارمەتیی بچووکەکانیان دەدا و پرچیان بۆ دەکردن، هاوکاتیش فرسەتیان لێ دەهێنان و هێندە قژیان ڕادەکێشان تا بەدەم ئازار و ناڵەوە دەکەوتنە قریشکەقریشک. بەڵام قژی من، چونکە هێندەی کلکی ئەسپێک چڕوپڕ بوو، دەکرا چۆنت بووێت ڕایبکشیت، بۆیە لەبری ئەوە گوێیان ڕادەکێشام. دوای ئەمانە دەبوو پێڵاوەکانمان لە پێ بکەین، بەڵام هەر ئەوەندەی خۆم بۆ

توندکردنیان دەچەماندەوە، ئیتر بۆن و بەرامەی شۆربای برنجی سووتاو دەگەیشتە کونەلووتەکانم و یەکسەر کەیف و خۆشیی ئەو بەیانییەم لێ تێک دەچوو و بە سەروسەکوتی مۆن و گرژەوە بەرەو هۆڵی نانخواردنەکە دەبوومەوە.

هیچ ڕێیەک نەبوو کە بتوانیت خۆت لەو شۆربا سووتاوە دەرباز بکەیت، چونکە ئەوەی شۆربای نەخواردایە ڕێشی پێ نەدەدرا ئەو پارووە خۆشە بخوات کە یەکپارچە بە زەردیی کەرە سواخ درابوو و منیش یەک لە دوای یەک و بە قێزوبێزەوە بە شێوەیەک کە پەرەی کونەلووتەکانم بەدەم قێزکردنەوە دەلەرینەوە، کەوچکە شۆربام دەکرد بە قوڕگمدا و دوای دواکەوچکیش خێرا قومێک شیری خاوم بەسەردا دەکرد و بەپەلە پڕم دەکرد بە پارووە گەرموگوڕەکەدا و نەختێک ڕەنگوڕووم دەکرایەوە.

هەموو بەیانییەکیش هەریەکە و هاوڕێیەکی تازەمان بۆ خۆمان هەڵدەبژارد، قۆڵمان لە قۆڵی یەکتر دەکرد و هەموو پێکەوە بەرەو قوتابخانە، کە کەوتبووە قەڵایەکی کۆنەوە، دەڕۆیشتین. لە کاتێکدا کە ئەوانی تر خەریکی ئەوە بوون ڕاز و نهێنییەکانی خۆیان بە گوێی یەکتردا بچرپێنن، من دەڕۆیشتم و بە نیگەرانییەوە بیرم لەو ژێرخانە دەکردەوە کە دەبوو، بەر لە گەیشتن بە پۆلەکانمان، بە ناویدا ڕەت ببین. لە ژێرخانەکەدا پێڵاوی دەرەوەمان دادەکەند و پێڵاوی ژوورەوەمان لە پێ دەکرد. هەر کە دەشگەیشتینە سەر پلیکانەی ژێرخانەکە بە هەڵپە و پەلەپەل خۆم پێش ئەوانی تر دەخست و خۆم دەگەیاندە پێڵاوەکانم، ئازا ئەوە بوو پەلە بکات و بە تەنیا بۆ خێوەکانی ئەو قەڵا کۆن و داڕزیوە بە جێ نەمێنێت، دەیانوت: دوایی خێوەکان دێن و قاپقاپەکانمان بە

شێوەیەکی وا تێکەڵوپێکەڵ دەکەن، کە کاتێک دەگەڕێینەوە بۆ لایان، دۆزینەوەیان زۆر زەحمەت بێت.
بەڵام بەیانییەکە هەر بەو ئاڵوگۆڕە ترسناکەی پێڵاوەکانمان کۆتایی نەدەهات، بەڵکو دەبوو دوو دوو بچینە ناو هۆڵێکی گەورەوە، کە لە سووچێکیدا ئۆرگێک دانرابوو و بەسەر دانە ڕەشەکانی ئۆرگەکەشدا مامۆستایەکمان بە خۆی و پرچە ڕەشەکانیەوە خۆی بەسەردا چەماندبووە و وا دەهاتە پێش چاو بە دەستوپەنجە درێژکۆلە و خەواڵووەکانی ئاوازێکمان بۆ دەژەنێت، دەنگی ئێمەش بە خاوخلیچکییەوە دوای ئاوازەکە دەکەوت و کاتێکیش لە گۆرانییەکە دەبووینەوە مامۆستایەکی ترمان، ئەویش بە سەر و پرچی ڕەشەوە، دەهاتە پێشەوە و دەستەکانی لەسەر ورگی کردبوو بە یەکدا و بە دەنگێکی زیقن دەپاڕایەوە، ئەوەی دوای پاڕانەوە و نوێژکردنی ئەویش لەسەر ئێمە بوو، ئەوە بوو هەموو پێکەوە بڵێین: ئامین. دوای ئەوەش کە دەمانوت: ئامین، دوودەرییەک باڵە زلەکانی خۆی بە ڕووماندا دەکردەوە، ئاودیوی دەبووین و بەسەر پۆلە جیاجیاکاندا دابەش دەبووین، لەسەر ڕەحلە ڕەقوتەقەکانمان دادەنیشتین و تەختە و تەباشیرمان بە دەستەوە دەگرت و ئامادە و تەیاری دەرسخوێندن دەبووین. ڕۆژەکەش بە خۆی و حیکمەت و زانستیەوە دەستی پێ دەکرد.

***دارێک بە دەستەوە***، بە خۆی و چاوە زرپ و زیتەکانییەوە بەناو پۆلەکەدا دەگەڕا و بە دەنگێکی زیقن ڕاز و نهێنیی پیتەکانی دەدرکاند. ئێمەش بە دەستوپلی ئارەقاوی و بە شێوەیەک کە پەنجەکانمان لە دەوری تەباشیرەکەی دەستمان گۆت بووبوون، یەک لە دوای یەک، وێنەی پیتەکانمان دەکێشا و، هێندەش بە توندی دەستمان لەسەر تەختەکانی بەردەممان دادەگرت کە زریکەیان لێ هەڵدەستا، ئەویش گوێیەکانی خۆی دەگرت و دارەکەی لە دەست دەکەوتە خوارەوە و داوای لێ دەکردین کە لەبری ئەوە گۆرانی بڵێین، ئێمەش بە کەیف و خۆشییەوە تەباشیرەکانمان فڕێ دەدا و بە دەنگێکی ساختە و بێ سەر و بەر دەستمان بە گۆرانیوتن دەکرد و ئەویش دیسان دەستی لەسەر گوێیەکانی توند دەکرد و داوای لێ دەکردین بیبڕینەوە و بێدەنگ بین. ئەوجا دەستمان بۆ تەباشیرەکانمان درێژ دەکردەوە و، بەڵام ئەو بەسەرماندا دەیقیژاند و هاواری لێ دەکردین کە دەست لە تەباشیرەکانمان هەڵگرین و چاو پڕ لە فرمێسک چەند جارێک بەناو ڕیزەکاندا دەهات و دەچوو و دەموچاویشی لەنێو دەستەکانیدا دەشاردەوە و ئێمەش بێ دەنگ وەکوو مشک لە جێیەکانی خۆمان دانیشتبووین، پاشان دەچووە جێگاکەی خۆی و لێی دادەنیشت.

ماوەیەک بە پەنجەکانی دەکەوتە لێدانی تەختەی مێزەکەی بەردەمی، پاشان تەماشای سەعاتەکەی دەستی دەکرد، بەڵام تازە دەرس دەستی پێ کردبوو، دەستی بە ناوچەوانیدا دەهێنا و پڕی بە ڕاستەکەیدا دەکرد و بەتوندی دەکەوتە لێدانی مێزەکە و ئەوجا چاوە ڕەشەکانی بە ڕوومـاندا هەڵدەبڕی و هەر یەکسەر دەیدایینە بەر ڕێژنەی مەتەڵی

ژمارەی قورس قورس و، هەرجارێک یەکێک بە هەڵە وەڵامی بدایاتەوە، دەبوو بچووایەتە بەردەمی و پشتی دەستی بۆ درێژ بکردایە و ئەویش بە لا تیژەکەی دەکەوتە لێدانی و هەر ئەوەندە و دەنگی نووزە و گریان لە هەموو سووچ و قوژبنێک بەرز دەبووەوە. کە نۆرە هاتە سەر من، دەستم ڕاکێشایەوە و ڕاستەکە بەر ڕانی کەوت، لە غەزەب و تووڕەییدا دەموچاوی سوور هەڵگەڕا و شەپازلەیەکی توندی تێ سرەواندم و پێی وتم دوای تەواوبوونی دەرســــودەوریش دەبێت هەر لە پۆلدا بمێنمەوە، بەڵام پاشان ڕای گۆڕی و وتی کە دەبێت دوای نیوەڕۆ بچم بۆ ماڵەوە بۆ لای.

بۆ دوای نیوەڕۆ، نە ئارەزووی خواردن و نە ئارەزووی هیچ قسەوقسەڵۆکێکیشم هەبوو. کزۆڵە و لاواز چووم بۆ ماڵەکەی. کە لە دەرگاکەم دا، هێندەی خایاند تا دەرگاکە کرایەوە، کە هەستم بە ڕزگاربوون کرد و وەرگەڕام تا بەرەو ماڵ ببمەوە، بەڵام ڕێک لەو کاتەدا دەرگاکە کرایەوە و لە بەردەممدا قوت بووەوە. لێی سڵەمیمەوە. لەوە بوو نەیناسمەوە. چاوەکانی وەکوو گوڵاڵەسوورەی برسی تێیان دەڕوانیم، ژێرتەنوورەیەکی ڕەشی لەبەردا بوو و قژە ڕەشەکەشی وەکوو شاڵێکی پیس و شڕوپڕ بەسەر شانوملە ڕووتوقووتەکەیدا هاتبووە خوارەوە. بە دەستوبازووە ڕووت و قەڵەوەکانی باوەشی پێدا کردم و سەرمی کرد بە ژێر بنباڵیدا، کە دنیایەکی هێندە تووکن و بۆگەن بوو کە قەت لەوەوبەر چاوم بە دنیای وا نەکەوتبوو.

کە چووینە ژوورەوە، دەستی لێ بەردام و بانگی کەسێکی کرد. ئەوسا یەکێکی تر لە مامۆستاکانمان هاتە ژوورەوە، ئەویش هەر ژێرتەنوورەیەکی ڕەشی لەبەردا بوو و قژە ڕەشە دانەهێنراوەکەشی بەردابووەوە. لەوە دەچوو تازە لە گریە و

لووشکەلووشک ژێر بووبێتەوە، کەچی چڵێسانە سەیری منیشی دەکرد. ئەوجا ژنی یەکەم لە باوەشی گرتم و لە یەک کاتدا هەم لێی دەدام و هەم بەنازەوە دەستی پێدا دەهێنام و منیش دەگریام و ئەوانیش هەردووکیان لەگەڵمدا دەگریان و پێدەکەنین و ئاهوئۆفیان دەکرد و، ئیتر ئەوەی لە باوەشی گرتبووم دەستی لە لێدانم هەڵگرت و هەر تەنیا دەستی بە لەشمدا دەهێنا. دەستی بە سەیرترین جێیەکانی لەشمدا دەگێڕا و دەموچاوی هەردووکیشیان بەسەرمەوە وەکوو کڵپەی ئاگر سوور هەڵگەرابوون، منیش دەگریام و هەوڵم دەدا خۆم لە دەستیان ڕزگار بکەم و پێم وابوو کە کەوتوومەتە باوەشی گیانلەبەرێکی تووکنی زەبەلاحی دوو سەرەوە و بەردەوام بە چوار دەستوباهۆی قەڵەو تێمئاڵاوە و پەنجە برسی و چڵێسەکانی بە لەشمدا هەڵدەگەڕێن. تا وای لێ هات ئیتر تاقەتی بەرەنگاریم نەما و بێدەنگ لەبەر دەستیاندا پاڵ کەوتم. ئەوجا بەریاندام و ناچاریان کردم قومێ چا بخۆمەوە و بسکیت و کێکیش بخۆم و بەر لەوەش بڕۆم قژیان بۆ داهێنام و پێیان وتم لە خانەی منداڵانەکە بڵێم کە خولقی بسکیت و چا و کێکیان کردووم، بۆیە وا درەنگ گەڕاومەتەوە بۆ ماڵەوە.

کاتێک گەڕامەوە، خۆر ئاوا بووبوو، بەڵام من زمانم چووبووە کلیلە و هیچ قسەوباسێکم لا نەبوو، هەر نەشمدەزانی چیم بەسەردا هاتووە، تەنانەت لەوەش حاڵی نەدەبووم کە بۆچی تا ماوەیەکیش هەستم بە شەرمەزاری و تەریقی دەکرد.

**زۆر بەزەییم** بە گوڵ و بەردەکاندا دەهاتەوە، چونکە هەمیشە لە هەمان جێگادا ڕوابوون و، لە هەمان جێدا ئارامیان گرتبوو، وا بە خەیاڵمدا دەهات، کە بەختەوەرتر بن ئەگەر لە جێگایەکانی خۆیان بیانگوێزمەوە و، دەستەکانم لە دەوری گوڵەکان بە قووڵایی خاکەکەدا ڕۆ دەکرد، تا بە هەموو ڕەگاکانیانەوە دەرمدەهێنان و، پاشان لە جێیەکی تردا لە تەنیشت جۆرێکی ترەوە دەمڕواندنەوە، بەردەکانیشم لەسەر ڕێگاکەوە دەگواستەوە و لەگەڵ خۆمدا بەرەو دارستانم دەبردن، یان لە پاڵ قەڵبەزەیەکدا دامدەنان، یان لە قەڵبەزە و دارستانەکەوە بەرەو باخچەکەی خانەی منداڵان دەمگواستنەوە.

هەروەها، بەزەییم بەو بوونەوەرانەدا دەهاتەوە کە زۆر بە هێواشی خۆیان دەخشاند و هەرگیز بە جێیەک نەدەگەیشتن، بە چیلکەیەک هێلکەشەیتانۆکەم بەرز دەکردەوە و یارمەتیم دەدا تا زیاتر بەرەو قووڵایی تاریکییە پڕ لە سەوزاییەکە سەر بکەوێت. بێدەنگی و بێجووڵەیی دەوروبەری شارەمێرووله ئازاری دەدام. بەڵام کاتێک کە دارێکم دەکرد بەنێو دیوارە ئاگرینەکەیدا، یەکەوڕاست ژیان لەنێویدا دەگەڕا و مێروولەکانیش بەملاو و ئەولادا دەکەوتنە جووڵە و، بازنەیی لە دەوری کۆشکەکەی خۆیان دەگەڕان، بەڵام کە لەوە زیاتر ڕووی نەدەدا بۆ شارەکەیان دەگەڕانەوە و هەموو شتێکیش هێمن دەبووەوە و دەگەڕایەوە دۆخی جارانی. هەمان شت ڕووی دەدا کاتێک بەردێکم بۆ نێو دەریاچەی دارستانەکە هەڵدەدا، بۆ ماوەیەکی کەم دەریاچەکە ئەڵقە خەمبارەکانی خۆی نیشان دەدا و، پاشان بۆ نێو ئارامییە گرژ و مۆنەکەی خۆی دەگەڕایەوە.

بەرگەگرتنی بێدەنگییە سەرسەختەکەی دەمەوئێوارانی هاوین ئاسان نەبوو. دەمویست ئەو دیوارانەی لە هەڵمژینی تیشکی خۆر تێربووبوون بە ئاگا بهێنمەوە و، یەک لە دوای یەک، تۆپەکانمم دەگرتە پانتاییە بێدەنگەکانیان، بەڵام تەنانەت، یادی ئازارێک، یان بچووکترین جێبرینیان لە پاش خۆیان جێ نەدەهێشت، ئەو ڕووەکەش کە خۆی بەسەر دیواری ماڵەکەدا شۆڕ کردبووەوە، ئارامییەک باڵی بەسەردا کێشا بوو، ئارامتر لە بێدەنگیی نێو گۆڕ، ئەو بەردانەی تێم دەگرت تەنیا، بۆ چاوترووکانێک، سەرسامییەکی کەمی لەنێو ئەو باڵندانەدا، کە لەوێ هەڵنیشتبوون، دەخوڵقاند و پاشان باڵەکانیان دادەدایەوە و لەنێو خەونەکانی خۆیاندا نقووم دەبوون.

پڕ بە دڵ دەمویست هەڵبکوتمە سەر سروشت و بێدەنگییەکەی بشێوێنم: تێنەدەگەیشتم کە، هەرشتێک، لە بێدەنگیدا گەشەی دەکرد و ژیانی تێ دەگەڕا.

ڕۆژێکیان، گەورەترین بەرد کە دەمتوانی هەڵیگرم، هەڵمگرت و بەرەو دەریام گواستەوە. ئەو جێیەی بەردەکە تێیدا ئارامی گرتبوو، تاریکییەکی شێداری گەورە بوو، لەو جێیەدا جیهانێکی تەواوم لە بوونەوەرە ورد و بچووکەکان دۆزیەوە. بەردەکەم بەردایەوە، دانیشتم و سەرنجم لەو جیهانە دا، کە بەردێک بۆی بووبووە ئاسمان. کرمی جۆراوجۆر لە یەکتر ئاڵا بوون و مێرووی بچووک بچووکی تەنکتر لە قاچی حەشەرەیەک، سەرلێشواو، بە هێلکە سپییەکانی سەر سەریانەوە، بەدوی تاریکییەکی تردا، ڕێی خۆیان گرتبووە بەر. هەزارپێیەکان و بوونەوەرە وردەکانی تر، بێ ئەوەی بە جێیەکی تر بگەن، قاچەکانی خۆیان دەجووڵاند، خۆیان قووڵتر لە تاریکییەکە هەڵدەچەقاند و کرمەکانیش خۆیان لوول

دەدا و لە باوەشی یەکتر دەبوونەوە، بۆ ئەوەی هەر یەکە و بە تەنیا خۆ لەژێر بەردی تازەتر بخزێنێت.

لە کارەکەی خۆم زۆر ڕازی بووم و پێم وابوو، جیهانێکم گۆڕیوە، بە ڕەزامەندییەوە بەردەکەمم هەڵگرت و بەرەو دەریاکە کەوتمە ڕێ و، لەوێ، لەنێو لمەکەدا جێگایەکم بۆ هەڵکەند.

دەریا ددانەکانی خۆی پێشان دا و ماسییە مردووەکانی بەرەو کەنار هەڵدا، ئەو ماسییانەی بە چاوە خوێناوییەکانیانەوە لە ئاسمانیان دەڕوانی. بە شەق چەند ماسییەکم فڕێدایەوە نێو دەریا، بەڵام هەر زوو ڕەوانەی کەناری کردنەوە. ماسییەکانم جێهشت و لەسەر لمەکە، کە بە تیشکی خۆر گەرم بووبوو، دانیشتم. سەرقاڵ و خەیاڵڕۆیشتوو دەستم بەنێو لمەکەدا کرد و پاشان لەنێو پەنجەکانمەوە ڕۆم کردەوە. کاتێک لەولای خۆمەوە گوێم لە دەنگی بەربوونەوەی شتێکی تاریک بوو، سەری دنیام لێ هاتەوە یەک، بەرەو ئەو لایە ڕامکرد و باڵندەیەکی مردارەوەبووم بینی. هەڵمگرتەوە و لەنێو لمەکەدا لە گۆڕم نا. بەرگەی ئەوەم نەدەگرت سەیری باڵندەی مردوو بکەم.

کاتێک گەڕامەوە جێیەکەی خۆم، لەو جێیەدا کە دانیشتبووم، چاڵێک هەبوو. بیرێکم بە خەیاڵدا هات. یارییەک دەکەم و وا پێشان دەدەم کە مردووم و خۆم لەنێو لمەکەدا نقووم کرد. لەهێکڕا، دەستم بە هەڵکەندنی لمەکە کرد. سەرەتا خۆم لەنێو لمێکی نەرم و گەرمدا نقووم کرد، پاشان ساردتر بوو، ئەنجامیش لمەکە قورس و تاریک بوو، لە بنی تاریکییەکەشدا کرمی سپی و ترسێنەر کەوتنە جووڵەجووڵ. چیتر نەموێرا، لەوە زیاتر، بە پەنجەکانم لمەکە هەڵکەنم.

هەستام و لە شتێک گەڕام لەبری پەنجەکانم بە کاری بهێنم. هاوکات، خۆر لە پشت پەڵەهەورێکی گەورەوە ون بوو، دەریا و لمەکەش بوونە تاریکییەک و، هەر کە چاوەکانم داخست تاریکییەکە پڕ بوو لە کرم و لەپێش چاومدا دەجووڵانەوە. بە ڕاکردن، لەنێو گۆڕە نیوەهەڵکەنراوەکەم دەرپەڕیم و خۆم گەیاندە جێیەکی ڕووناکتر. هەورەکە بەرۆکی خۆری بەرنەدەدا و بەدرێژایی ڕۆژ بەدوایەوە بوو و منیش هەر ڕامدەکرد و چەندان جاریش کەوتمە نێو تاریکییەکەی خۆمەوە.

**نە من** خاوەنی هیچ شتێک بووم و نە هیچ کەسیش خاوەنی من بوو. ئەم ڕاستییە، هەندێک جار، هێندە بە قووڵی کاری تێ دەکردم کە بەنێو چاڵێکی گەورەدا ڕۆ دەچووم و چەند ڕۆژێکی پێ دەویست تا لێی دەهاتمە دەرەوە. کچەکانی تر زۆر گرنگییان بە شتەکانی خۆیان دەدا و ئاگاداریان دەبوون، زۆرجار شتێکیان: بووکەشووشەیەک، ئەو خرکەبەردەی بەدیهێنەری هیوا و ئاوات بوو، ئەو سەرینە بچکۆلانەیەی دەرزی تێ هەڵدەچەقێنرێت، بەدەم خەون و خەیاڵاتەکانیانەوە لە ئامێز دەگرت. منیش جاروبار بۆم هەبوو شتێکیان لێ قەرز بکەم، بەڵام هەر کە بۆم دەگەڕاندنەوە، چاڵەکە هێندەی تر گەورە دەبوو.

هەندێ جار یاریی ئەوەم دەکرد کە خاوەنی گوڵێکم، لەگەڵ خۆمدا دەمبردەوە بۆ ماڵەوە و بە درێژایی شەو لەپاڵ خۆمەوە لە جێگاکەمدا دامدەنا، بەڵام بۆ سبەی سیس دەبوو و دەژاکا و ئیتر هی ئەوە نەبوو هەتبێت، هەربۆیە بڕیارم دا ببمە خاوەنی شتێک کە نەمر بێت و بۆ گەڕان بە دوای بەردێکدا لە ماڵ دەرکەوتم. چوومە بەر ئەو قەڵبەزە بچکۆلەیەی کە بەردەکان لەبەریدا پاڵ کەوتبوون و خۆیان فێنک دەکردەوە. بەردێکی بۆری شینباوم هەڵگرتەوە، هێندە گەورە بوو کە لەنێو مشتمدا جێی ببێتەوە. دەماری سووری بچکۆلە، پێچاوپێچ، بەناو بەردەکەدا بڵاو بووبوونەوە و ئەگەر بمدایەتە بەر ڕووناکیش، وەک ئەوەی پڕ بێت لە ئەستێرەی بچکۆلە بچکۆلە، دەدرەوشایەوە. لە جێیەکی بەردەکەدا قووڵاییەک هەبوو، ناوم لێ نا چاڵی خەندە و پێکەنین و لە دەوروبەری ئەو چاڵەش تاڵی وردیلەی سەوزایی ڕووابوون کە بە چمکێکی بەرکۆشەکەم وشکم کردنەوە و لامبردن. چونکە ئەو بەردە دەبوو بە هی من، بە جوانی و ڕێکوپێکی پاکم کردەوە و بە کامی دڵ لە مشتم توند کرد و بە خۆم و ئەو شتە تازەیەمەوە بۆ ماڵ گەڕامەوە.

ڕۆژانە هەمیشە بەردەکەمم لەگەڵ خۆم هەڵدەگرت. یان لە گیرفانی کراسەکەمدا بوو و هەستم دەکرد چۆن بەر ڕانم دەکەوێت، یان لەنێو دەستم توند دەکرد و لە کاتی وانەکانیشدا ئەم دەست و ئەو دەستم پێ دەکرد و بەوەی کە ئەوم لە لایە هەستم بە دڵنیاییەکی تەواو دەکرد. شەوانە لەپاڵ خۆمدا لە جێگاکەدا دامدەنا و هەندێک جاریش تا خەو دەیبردمەوە لەنێو دەستمدا بوو، جاروباریش دەمخستە ژێر سەرینەکەمەوە یان لەپاڵ ڕوومەتمەوە دامدەنا.

بەڵام ڕۆژێکیان لە کاتی وانەوتنەوەدا بەردەکەمم لە دەست بەر بووەوە و بەسەر ئەرزەکەدا تلۆر بووەوە. بەپەلە دوای کەوتم و بەردەکە و دەستمم لە گیرفانمدا شاردەوە. مامۆستاکەم بە دەنگێکی تازە بێداربووەوە هاواری لێ کردم: بێنە بزانم چیت پێیە؟ وتم: هیچ... و دەستم توند لە بەردەکەم گیر کرد، وتی: وەرە بۆ ئێرە و دەستیشت لە گیرفانت دەربهێنە. بە دوودڵییەوە دەستم لە گیرفانم دەرهێنا. ئەو خێرا دەستی لە گیرفانم ڕۆکرد، بەردەکەی دەرهێنا و خستیە سەر مێزەکەی بەردەمی. گریام و داوای بەردەکەمم کردەوە. ڕووی لە کچەکانی تر کرد و وتی: شتی وا سەیرتان بیستووە، بیستووتانە کەس بۆ بەرد بگری! و بەرەو پەنجەرە کراوەکە ڕۆیشت و بەردەکەی بەرەو باخچەکە فڕێ دا. تا دەرسیش لێ بووەوە لە سووچی تەریقبوونەوەدا ڕایوەستاندم و منیش بەسەر لەدەستدانی بەردەکەمدا دەملاواندەوە و دەگریام.

کە دەرس لێ بووەوە بۆ دۆزینەوەی بەردەکەم بە هەڵەداوان خۆم گەیاندە باخچەکە، بەڵام چەند گەڕام و کۆشام نەمدۆزییەوە.

***ئێواران*** کاتێک کە تاریکی ئاسمانە ڕەشەکەی خۆی بەسەر دنیاکەماندا دەدا، ئیتر کاتی ئەوە بوو ڕووداوەکانی ڕۆژ بژێنینەوە. ئیتر ماوەی نێوانی جێگاکانمان هێندە فراوان و قووڵ دەبوو کە بە زەحمەت، وەکوو ئەوەی کە هەموو بەیانییەک کردبوومان بە عادەت، دەستمان بە دەستی یەکتری دەگەیشتەوە. وەکوو ئەستێرەی تاک و تەنیا بەنێو ئاسمانی تاریکدا دەگەڕاین. جاروبار لە دوورگەکانی خۆمانەوە بە گوێی یەکتریدا دەمانچرپاند، بەڵام بە دەنگی خۆمان بە ئاگا دەهاتینەوە و دەترساین. هەندێک جار دەنگی گریانی ئەستێرەیەک لە سووچێک بەرز دەبووەوە، بەڵام نەماندەوێرا بچین بە لایەوە و دڵی بدەینەوە. جاروباریش یەکێک دەیوێرا و قاقایەکی لێ دەدا و ئێمەش بە ئاستەمێک ڕووناکیی ڕۆژمان بە بیر خۆمان دەهێنایەوە.

لە کاتێکدا هۆشیاری وەکوو چرایەکی نادڵنیا لەنێوان دەروازەی شەو و ڕۆژدا دەهات و دەچوو، بێ جووڵە لە جێگاکانماندا پاڵ دەکەوتین. هێشتا ڕۆژ لەنێوماندا لەسەر یاریکردنی خۆی بەردەوام بوو: یاری دەکرد و وەکوو پشیلەیەک خۆی بۆ تۆپەکەی هەڵدەدا، یان بە تەباشیرە سپییەکەی قیژوهوڕی لە دەموچاوی ڕەشی تەختەکە هەڵدەستاند، یان چنگی بە کۆچی گوێیەکانمدا دەکرد و دەیگرت، یان بە بێدەنگی دادەنیشت و لەگەڵ جۆگەلەکاندا خەوی دەبینی. جاروباریش چاوی لێ مۆڕ دەکردینەوە و هەندێک لە ڕۆژەکانمان پڕ دەبوون لە شتی یاساغ و قەدەغەکراو، کە تەنیا دەمتوانی لە تاریکیدا سەرپێچییان لێ بکەین.

لە تاریکیی شەودا لە دوورگەکانماندا پاڵ دەکەوتین و گەمیەی بچکۆلەی خەون و خەیاڵاتەکانی خۆمان بەسەر

ئاوێکی یاساغکراودا بۆ یەکتری دەنارد و ژووره هاوبەشەکەمان پڕ دەبوو لەو گەمییانەی سەرکەوتووانە ئەم جێی یاساغیان داگیر دەکرد و ڕوویان لە داگیرکردنی جێیەکی قەدەغەکراوی تر دەکرد.

بێ سنوور دڵم بەو گەمییەگەشتانە دەکرایەوە. بەڵام زۆرجار ئەوەش ڕووی دەدا کە گەمییەکان ژێر ئاو دەکەوتن و، بەر لەوەی خەو لە چاوی من بکەوێت، یەک لە دوای یەک، دەکەوتنە بن قووڵایی خەوەوە و نوقوم دەبوون و منیش بە تەنیا لە جێگاکەمدا دەمامەوە و گوێم بۆ نەرمەبایەکانی خەون ڕادەدێرا، کە تا دەهات گەمییەکانی لێ دوور و دوورتر دەخستمەوە و لە کۆتاییشدا تەنیایی زەفەری لێ دەهێنام و هەستم بەوە دەکرد کە چۆن لەنێو هەڕەشە و پاڵەپەستۆی ئاوە ساردوسڕەکەیدا دەیپێچامەوە.

ئەوسا دێوەزمەکانی شەو دەهاتن و لەسەر قەراغی قەرەوێڵەکەم دەدانیشتن و بەردی زل و گەورەیان لەسەر سنگم دادەنا. پاشان جێگاکەمیان بەرز دەکردەوە و بەوپەڕی خێراییەوە بەرەوخوار و سەرەوژووری پلیکانەکانیان دەکرد، تا ئەو کاتەی ئیتر جێگاکەمیان لە هەورەبانەکەدا دادەنا و لەوێش بایەکان شمشاڵەکانی خۆیان دەردەهێنا و دەستیان دەکرد بە لێدانی ئاوازی سکاڵای خۆیان و پەنجەرە نیوەکراوەکانیش وەکوو باڵی شەمشەمەکوێرە بە یەکیاندا دەدا و، ڕێک لەو کاتەدا دەمتوانی سەروسیمای دێوەزمەکان ببینم کە تەنیا وەکوو دوو ڕیزە ددانی جیرەجیرِ پێکەوتوو بوون و هێندەش بە توندی بە دەستەکانیان پاڵیان بە سنگمەوە دەنا کە نەمدەتوانی هەناسە بدەم و بە شێوەیەک لە قووڵاییە ترسناکەکەی خۆیانەوە دەیاندا لە قاقای پێکەنین کە قیژەوهاوارەکانی منیان تێدا دەخنکا.

پاشــان تەواو کـشــومـات دەبوو و هـەسـتم بەوە دەکـرد چۆن ئارەقــە وەکــوو وردەمــێــرووله بەســەر لەش و ناوچەوانمدا هەڵدەگـەڕا، بەڵام کـە بۆ گــوێگرتن لە جـێگاکـــەم ڕاست دەبوومــەوە، تەنیـا دەنگی شنەبای خـەوم لە سـووچەکـانەوە دەهاتە بەر گوێ و لەوە تێدەگەیشتم کە دێوەزمەکان بە جێیان هێــشــتــووم و منیش ئازاد لە دەست ئەوان دەکـەوتمە نێــو قووڵایی خەوی خۆمەوە.

زۆرجار منیان هەڵدەبژارد و، بە جۆرێک کە تەواو ئازاری دەدام، چاویان توند بە پەڕۆیەک دەبەســـتــمـــەوە، ئەوجــا دەیانخـولاندمـەوە و، دەیانخـولاندمـەوە تا بە تەواوی گـێـژ دەبووم. پاشــــان بە پێکەنینەوە لە دەورم کـــۆ دەبوونەوە و هاواریان دەکـرد، هەوڵ بدەم بیـانگرم. پەنجەکـانم بە هەوادا بڵاو دەکـردەوە و نادڵنیـا بەو نێـوەدا دەگـەڕام. هەندێ جـار هەسـتم بە پرچێکی ڕەق، یان گـۆنایەکی نەرم دەکـرد، بەڵام هەرزوو برووسکەئاســا، گــۆنا و پرچەکـــە، ون دەبوونەوە. ئەوانیش دووبارە دەیانخـولاندمـەوە، بە پەلە و بە پێکەنینەوە هەڵیان دەکوتایە سەرم و دیسان بڵاوەیان لێ دەکردەوە. کە دواتر پەڕۆکـەیان لە چاوەکـانم دەکــردەوە، ئاســان نەبوو، یەکـســەر، پێـڵـووەکـانم لێکتـر جـیـا بکەمــەوە، پێم وابوو چاوەکانیان تێک داوم و دەستم بە گریان دەکرد.

جارێکیان، لە کاتی یاریکردندا شتێک ڕوویدا، ترساندنی و بێ ئەوەی پەڕۆکە لە چاوەکانم بکەنەوە، بە تەنیا و بە ڕاکردن بە جـێـیـان هێـشـتـم. لەوێدا، تەنیـا و لە بۆشـاییـە کـتـوپڕەدا، ڕاوەستام و هەستم کرد ترسێک، بێ ئەوەی بتوانم بیبینم لە چ لایەکـەوە دێت، لێم نزیک دەبێـتـەوە. کـاتێکی زۆری خـایاند تا پەڕۆکـــەم دادڕی، چاوەکـــانم نەدەکــرانەوە، مـــەحـــاڵ بوو!

برژانگەکانم، وەک ئەوەی بەیەکەوە نووسابن، وابوو. قیژاندم: ناتوانم ببینم! لەو کاتەدا، گوێم لە دەنگێک بوو هاواری دەکرد: خۆتان لادەن! لاچن! بەڵام هەر کە ویستم بڵێم: ناتوانم ببینم... برژانگەکانم لێکترازان و کوڕێکم بینی، قردێلەیەک بە دەستەوە و، لەوسەری جادەکەدا لە چاو ون بوو.

لە خەوندا، زۆرجار، ڕوو دەدات کە ناتوانم چاوەکانم بکەمەوە. ئەگەر سواری عەرەبانەیەک بم و ئەسپەکان بکەونە غاردان و هاوارم لێ بکرێت خۆ هەڵبدەمە خوارەوە، ئەوکات، لەپڕێکدا، بەرچاوم تاریک دەبێت، هیچ نابینم و ناچار، دەبێت کەسێک هەڵمبداتە خوارەوە. کە ماوەیەکی خۆش بۆ مەلەکردن لە ژێر ئاودا دەمێنمەوە و قژم لە ژێر ئاوەکەدا وەک ئالایەکی ڕەش دەشەکێتەوە، ماسییەکانیش وەک گوڵی بێدەنگ بە دەوری دەست و قاچەکانمدا مەلە دەکەن و لق و پۆی درەختەکانی نێو ئاویش دەستم پێدا دەهێنن، لەپڕێکدا دەنگی تیژ و زیقنی فیکفیکەیەک دەبیستم و دەزانم کە دەبێت سەر ئاو بکەوم، مەلە دەکەم و مەلە دەکەم، بەڵام کاتێک دەکەومەوە سەر ئاوەکە ناتوانم چاوەکانم بکەمەوە، بۆیە دیسان خۆ دەکەمەوە بەژێر ئاوەکەدا و دەتوانم سەرلەنوێ ببینم. هیچ چارە نییە، لەگەڵ ئەم بینینەی نێو قووڵایی دەریا و نابینایی لە ڕۆژی ڕووناکدا، بۆ ماوەیەکی درێژ، دەبێت بجەنگم و ئاکامیش کە چاوەکانم دەکرێنەوە و دەتوانم ببینم ئەوەم بۆ ڕوون دەبێتەوە: کە هیچ شتێک نییە شایانی بینین بێت، هیچ شتێک.

***ناچاری بکە***، ناچار کرا، ناچارە!
وتیان: ناچاریان کردم بەوەی کە خۆم ناچاری پێکەنین بکەم، چونکە ناچاربووم پێبکەنم، چونکە مرۆڤ ناتوانێت تەنیا لەسەر باران و هەور بژی!
هێندە بە داواکانیان ناچاریان کردم، کە ناچار بووم لە دەست داوا ناچارییەکانیان هەڵبێم، بەڵام دەیانگرتمەوە و بە پێکەنینەوە دەیانوت: مرۆڤ ناتوانێت بە خۆدەربازکردن بژی.
ناچاریان کردم سەر جۆلانێیەک بکەوم و بەدەم گۆرانیوتنەوە دیلانێیان پێ کردم و بە دەنگە نەرمونیان و میهرەبانەکانیان هاواریان لێ کردم: هەر هێندەت زانی و وەکوو باڵندەیەک هەستت بە دڵشادی و ئازادیی خۆت کرد.
بەڵام ئەوان هێندە زۆر و هێندە بە بەرزییەوە و بەنێو ئاسمانی شیندا، کە ناویان لێ نابوو ئازادی، دیلانێیان پێ کردم کە من بە نیگەرانی و دڵتەنگییەوە هەستم بەوە کرد کە ئازادی و بڵندی ناخۆشترین شتن.
بێ ئەوەی هیچی ترم لە دەست بێت، دەستم لە گوریسەکانی دیلانێیەکە، کە پرچەکانی خۆمیان بیر دەخستمەوە، توند کردبوو و بەر لەوەی لە دیلانێیەکە بەر ببمەوە، بیرم کردەوە: بەڵام کێ دەتوانێت لە هەوادا خۆی بە پرچەکانی خۆی بگرێتەوە.
دەمم پڕ بوو لە زیخ، ئەژنۆ و لەپی دەستەکانیشم پڕ بوون لە خوێن و زیخ و کە ویستیشم بە پاڵکەوتوویی لە ئەرزەکە بمێنمەوە و ئێش و ئازارەکەم بە گریان دەربڕم، بە دەستومەچەکە بەهێزەکانیان ناچاریان کردم و لە ئەرزەکە بەرزیان کردمەوە و زۆریان لێ کردم کە خۆم ناچار بکەم نەگریم، چونکە ناچار بووم بە پێکەنین و وتیان: مرۆڤ ناتوانێت تەنیا لەسەر باران و هەور بژی!

بەڵام بیرم کردەوە: هەمیشە هەر ناچاری بکە، ناچار کرا و ناچارە! کاتێکیش کە بە داواکانیان ناچاریان کردمەوە سەر جۆلانێیەکە بکەومەوە و بە دەنگە پڕ خۆشی و شادییەکەیان قریشکەقریشکی گۆرانییەکەیان بەسەرمدا باراندەوە، وتم: دەبێت جارێک لە جاران ناچاریان بکەم گوێ لە گریانم ڕابگرن، چونکە مرۆڤ ناتوانێت تەنیا بە پێکەنینی وەکوو ئاسمان شین ژیان بەسەر بەرێت!

***(کای)***، تەنیا کوڕ بوو لە پۆلەکەماندا و دووزمانی بە دەمەوە کردم، لەبەر ئەوە بۆم نەبوو لە وانەی جمناستیکدا بەشدار بم و لەبری ئەوە دەبوو لەسەر ئەسپەکە دانیشم. سەعاتێکی تەواو ئەو ئەسپە بوو بە دنیاکەم و ئەسپێکی ڕاستەقینەش نەبوو، بەڵکو ئەسپەدارینە بوو و تا توانیشیان بە بادانی قاچەکانی بەرز و بەرزتریان کردەوە و پاشان هەڵیانگرتم و خستمیانە سەر پشتی و پشتیشی هێندە پانوپۆڕ بوو کە تەنانەت نەمدەتوانی ئەمدیو و ئەودیو قاچ لە پشتی توند بکەم و ناچار دەبوو هەردوو قاچم بە لایەکیدا شۆڕ بکەمەوە و لەوێدا دانیشتم. لە خواری خوارەوەش، لەسەر ئەرزەکە، (کای) و کچەکان پێکەوە جومناستیکیان دەکرد و قاچ و باسکیان بە هەوادا ڕادەوەشاند و وەکوو پەروانەی ئاش دەهاتنە پێش چاو، ئەژنۆیان دەچەماندەوە، هەڵدەستانەوە و دیسان ئەژنۆیان دەچەماندەوە و لە کۆمەڵە بۆقێکی بچکۆلە دەچوون و ئەوجا، وەک ئەوەی خۆ بۆ چنینەوەی بەری دەوەنە دوورەدەستەکان درێژ بکەن، لەسەر پەنجەکانی پێیان خۆیان درێژ دەکرد و پێدەکەنین و دەستی یەکتریان دەگرت و ئەڵقەیان دەبەست و بە دەوری خۆیاندا دەکەوتنە سەما و بۆ (کای) دەهاتنە سەر چۆک و یەک لە دوای یەک لەنێو ئەڵقەکەدا لەگەڵ (کای)دا سەمایان دەکرد و منیش بە درێژایی وەخت لەسەر پشتی ئەسپەکە دانیشتبووم و لەوە دەترسام بەر ببمەوە و هیچ شتێکیش نەبوو دەستی لێ توند بکەم و خۆمی پێوە بگرم و چاوم کەوتە ڕێشکەوپێشکە و ئەوجا کچەکان وەکوو مەیموونگەلی بچکۆلە بچکۆلە خۆیان بۆ دار و ستوونەکانی هۆڵەکە هەڵدەدا و خۆیان پێیاندا هەڵدەواسی و هەڵدەگەڕانەوە. منیش قنگم بە پشتی ڕەقوتەقی ئەو

ئەسپەدارینەیەوە نووسابوو، ئازاری دەدام و نەشمدەوێرا خۆم بجووڵێنم. وردە وردە فرمێسکەکانم داباریـن، هەموو شتێک وەکوو ئەوەی تەمێکی بەسەردا درابێت لەبەر چاوم تاریک بوو و دڵم کەوتبووە تەپەتەپ: چەندی تر دەبێت لێرەدا بمێنمەوە، چەندی ترم ماوە! هەر ئەوساش کچەکان دەستیان بە بازبازێن کرد و ئەوەندەش بە بەرزی خۆیان هەڵدەدا کە ئەرزەکە لە ژێر پێیەکانیاندا بە توندی دەجووڵایەوە و ئەسپەکەی منیش دەستی بە جووڵەجووڵ کرد و ئیتر هیچم نەبوو دەستی لێ توند بکەم و دەستەکانم لە هەوادا بەرز کردبووەوە و لە لایەکی ئەسپەکەوە خزامە خوارەوە. یەکێک هاواری لێ بەرز بووەوە: تەماشاکەن، وا کەوتە خوارەوە! و کەوتمە خوارەوە و لەلاوە سەرم شکا و ئەوانیش بە شیڕەشیڕ هەڵیانکوتایە سەرم و منیش دەڕشامەوە و هەڵیانگرتم و لەسەر کورسییەکی دارین دایاننام و هەموو شتێک لەبەر چاومدا دەسووڕایەوە و دەسووڕایەوە.

که لە قوتابخانەوە بۆ ماڵ گەڕاینەوە، (کای)، قڕوقەپی لێ کردبوو و لە هەموومان بێدەنگتر بوو.

**هەندێ ڕۆژ** مێشمان دەگرت. دەمانخستنە سەر پارووەکانمان و دەماندا بە پشیلەکە. یان لە تەونی جاڵجاڵۆکەیەکمان توند دەکردن و ئەگەر زۆر لنگەفرتێیان بکردایە، یەکسەر جاڵجاڵۆکەکە دەهات و سەرپۆشی مەرگی بەسەردا دەدان و دەیپێچانەوە، یان لەو مێشگرانەمان توند دەکردن کە بە ڕەنگە هەنگوینییەکانیانەوە لینج و لیقن بە بنمیچەکەدا شۆڕ بووبوونەوە و چەند ڕۆژێکیشی پێ دەویست تا مێشەکان دەمردن. ڕۆژانی واش هەبوون مێشەکانمان ڕزگار دەکرد. لەنێو دۆلکەی شیرەکەوە لە خنکان ڕزگارمان دەکردن، باڵەکانیانمان بە فووکردن وشک دەکردەوە. ئەو پشیلەیەمان دەردەکرد کە لەبەر هەتاوی پەنجەرەکەدا خەریکی ڕاوکردنیان بوو و لە مردنی لیقن و لینجی مێشگرەکانمان دەکردنەوە و بەڵام لەم حاڵەدا زۆربەی جاران یان قاچێک یان باڵێکیان لە دەست دابوو.

هەندێ ڕۆژیش، ڕۆژی باڵندەکان بوو. باڵندە بریندارەکانمان دەگرت و دەمانبردنە ژوورەوە و جێگامان لە پاکەتی بچکۆلانەدا بۆ ڕادەخستن و ئاومان دەدانێ و گژوگیامان بۆ دەڕنین و دەمانخستە بەردەمیان. بە ڕێز و حورمەتەوە باڵندە مرداربووەکانمان دەناشت و خاچی دارینەی بچکۆلەمان لەسەر گۆڕەکانیان دادەنا. ڕۆژانی تریش ئازا و گورجوگۆڵ لە باخچە بچکۆلانەکەماندا، کە هەریەکەمان پارچەزەوییەکی بچکۆلانەی هەبوو، خەریکی کارکردن دەبووین. گوڵمان دەچاند و خڕکەبەردی بچکۆلانەمان لە دەوریان دادەنا. ڕاڕەوەکانمان پاک دەکردەوە و بووکۆکە و یارییەکانی ترمان لەسەر ڕیز دەکردن. ئێواران، بە شێوەیەک کە ئیتر باخچە بچکۆلەکەمان دەبوو لەنێو

تاریکییەکی شێداردا چاو لێک بنێت، تێروپڕ ئاومان دەدا. جاروباریش ڕۆژ ڕۆژی کۆلارە و بایەکان بوو. دەمانتوانی چەندان سەعات ڕابوەستین و لە شەڕی نێوان با و کۆلارەکانمان بڕوانین و کاتێکیش کە کۆلارەیەک سەردەکەوت و لە هەوادا بەرز دەبووەوە لە کەیف و خۆشیدا دەستمان بە قریشکەقریشک دەکرد.

جاروبار بۆ جەژنی لەدایکبوونی یەکێک لە کچەکانی گوندەکە بانگ دەکراین و تا لە دەوری مێزەکە دابنیشتینایە و لە ژێر چاودێریی دایکی ئەو منداڵەدا کە جەژنی لەدایکبوونی هەبوو، خەریکی خواردنی کێک و خواردنەوەی شۆکولاتەکەی بەردەممان بووینایە هەموومان هەر کچان و دەستەخوشکانی یەک بووین، بەڵام هەر ئەوەندەی بۆ گەمە و یاریکردن بچووینایەتە باخچەکەوە ئیتر دەبووینەوە بە منداڵانی خانەی منداڵان و دەبوو لە سووچێکدا ڕاوەستابایین و هەر تەماشاکردنمان بۆ دەمایەوە.

بەڵام ئێمەی منداڵانی خانەی منداڵانیش کچێکمان دۆزیبووەوە کە پێکەوە هەموومان حەزمان لە چارەی نەدەکرد و بە نزمی سەیرمان دەکرد. ئەو لە قووڵایی دارستانەکەدا دەژیا و دایک و باوکیشی هێندە هەژار بوون کە لەبەر دەستکورتی بۆ قوتابخانەکەی ئێمە، قوتابخانەی خانەی منداڵانیان، دەنارد. ئەو کچە ناوی (کریستینە) بوو و دەیانوت: ئەسپێی هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا کە بە نزمی سەیرمان دەکرد و زۆر کەیفمان پێی نەدەهات، بەڵام بۆ جەژنی لەدایکبوونی بانگهێشتنی کردین. پێم وایە (کریستینە)، بە درێژایی ئەو دوو سەعاتەی کە جەژنی لەدایکبوونەکەی تێدا گیرا، لە هەموومان زیاتر هەستی بە تەنیایی کرد.

چەند ڕۆژ دواتر لە قەراخ دارستانەکەدا بینیمانەوە و لەوەش دەچوو بیەوێت بەرەو لامان بێت، بەڵام ئێمە دەستمان بەم ئاوازە کرد:

*کریستینەی ئەسپێون!*
*جێگاکەی پڕە لە کێچ*
*کێچی هاروهاجن! ناتوانێت بیانگرێت*
*چونکە هەموو باز دەدەن!*
*هەموو هەڵدەبەزنەوە!*

(کریستینە)ش بە هەڵەداوان خۆی کرد بە دارستانەکەدا و لەبەر چاومان ون بوو. من هێشتا چەند وشەیەکم لە دەم نەهاتبووە دەرەوە، کە هەستێکی سەیر دایگرتم و ڕۆژانی دوای ئەوەش پەستی و دڵتەنگی دایگرتبووم و هەر بیرم لە (کریستینە) دەکردەوە.

***(گورلی)*** پرسی: دەستی چەپ یان ڕاست؟ و دەستەکانی لە پشتییەوە شاردەوە. ئەگەر هەڵیبهێنیت، ئەوەی لە دەستمدایە بۆ تۆ. ماوەیەک لە وەڵامەکەم دوودڵ دەبووم و هەر هێندەی بڕیاری دەست ڕاستم بدایە، یەکدەم پەشیمان دەبوومەوە و، هەمیشەش هەروا بوو، یەکسەر دوای ئەوە دەمگۆڕی بۆ چەپ و زۆربەی جارانیش هیچم بە دەست نەدەهێنا. هەر بە هەمان شێوە بوو کاتێ یاریی دایک و باوک و منداڵمان دەکرد، چونکە زۆری دەخایاند تا دەمتوانی بڕیاری خۆم بدەم و بزانم دەمەوێت کامیان بم.

بەیانییەکی یەکشەممە سەرپەرشتیارەکەمان بە خۆی و دوو سەبەتەی پڕ لە تووترک و ڕەشیلەوە خۆی کرد بە ژووردا. بە کەیف و خۆشییەکەوە وتی: هەڵبژێرن؟ و ئەوەی زوو بڕیاری خۆی نەدایە هیچی پێ نەدەدرا. ئەوەی چاوەڕوانی نەدەکرد ئەوە بوو، کە یەکسەر دەستم درێژ کرد، بەڵام کە لێی پرسیم کامیانم دەوێت وتم: هەردووکیان! و هەر لەبەر ئەوەش هیچیانی نەدامێ.

مامۆستاکەمان وتی: وەرە بزانم و وەکوو کچێکی ئازا و بوێریش بە سزای خۆت بگە! بەڵام من لە ئاستانەی دەرگاکەدا وەستا بووم و دوودڵ بووم. ئەو بەردەوام بوو و وتی: سەری خۆت بەوەوە مەئێشێنە، خۆت دوا بخەیت. دەبێت هەر بە سزای خۆت بگەیت و چەندیش زیاتر خۆت دوا بخەیت، سزاکەت هێندە قورستر دەبێت. بەڵام هەر ئەوسا کە ئەوەندە خۆم خلافاندبوو، کە چیتر نەوێرم زیاتر لێی بچمە پێشەوە. ئیتر ئەو بەوپەڕی هێزیەوە پڕی بە پرچەکانمدا کرد و لە هەقی خۆشم زیاتری تێسرەواندم.

کچێکیان وتی: ناتوانیت زوو بڕیاری خۆت بدەیت، کام

تۆپیـانت دەوێت، سـوور یان زەردەکـە؟ هـێندە بە دوودڵـیـیـەوە تەمـاشـای هـەردووکـیـانم کـرد، تا ئاخـرێکەی وتـی: ئەگـەر هـەر ئێـسـتـا بڕیـاری خـۆت نـەدەیت، هیـچـیـانت نادەمێ! و مـنیش سـوورەکـەیانم هـەڵبـژارد. هـەر زووش پەشـیـمـان بوومـەوە و بە درێژایـی ئەو ڕۆژەش بیــرم هـەر لە لای تـۆپە زەردەکــە بوو و بیرم لەویان دەکردەوە.

ڕۆژێک سـەرپەرشـتـیـارەکـەمـان بانگـی کـردمـە ژوورەکـەی خـۆی و وتـی: ئێسـتـا ئیـتـر دەبێت لـەنێـوان مـانەوە لەم خـانەی منداڵانـە و گـــواســـتـنەوە بـۆ بـەشــــێکـی تـر و ڕۆیشـتن بـۆ (کۆپنـهاگن) بۆ لای خاڵ و خاڵۆژنت هـەڵبژێریت. ئەوان خـۆیان منداڵیان نییە و پڕ بە دڵ دەخوازن لای خۆیان بتـهێڵنەوە. من ئامـۆژگـاریی ئەوەت دەکـەم کـە ئەمـەی دواییـان هەڵبـژێریت، چونکە تۆ بە کەڵکی ئەوە نایەیت لە خانەی منداڵان بمێنیتەوە. بەڵام، بێگـومـان، دەبێت خــۆشت بـڕیاری خــۆت بدەیت و لە ئێستاوە تا هەفتەیەکیش مۆڵەتت هەیە بۆ بڕیاردان.

ئەو هـەفـتــەیە، چەنـد جـارێک، دوو مـرۆڤـی نامـۆ، هـاتن و سـەردانیان کـردین. هـەر یەکسـەر دڵـم چوو بە ژنەکەدا، بەڵام لە بەرانبەر پیاوەکەدا لە ترس و نامـۆیی زیاتر هەستم بـە هیچی تر نەدەکرد. لە دواسـەردانیانـدا، ژنەکە بە تـەنیا هـات و منیش بڕیارم دا لەگـەڵیدا بڕۆم، بەڵام هـەر یەکسـەر دوای ئەو بڕیارە دەسـتـم بە لووشکەلووشـک کـرد و نەمـویست لەگـەڵیـدا بڕۆم. بەڵام ئـەو ڕێک لـەو کــاتەدا هـێندە خــەمــبــار دیار بـوو کــە نەمتوانی دەست نەخـەمـە ناو دەسـتییـەوە و وتم: ئەگـەر گـفـتی ئەوەم دەدەیتێ بە (کارلا) بانگم نەکەیت، لەگەڵتدا دێم. ئەویش بە پێکەنینەوە گفتی دامێ و بە ڕێ کەوتین.

***لەگەڵ*** خەونە سەوزەکانی گیادا، کە هێشتا لە دەوری پێیەکانم گۆرانی دەچڕی، لەگەڵ تاریکیی قووڵی دارستاندا، کە هێشتا لەنێو چاوەکانمدا خەونی دەبینی، بە بیابانی بەردینی شار گەیشتم.

هەر ڕۆیشتین و بەرەوژوو لەم پلیکانەوە بۆ ئەو پلیکانە ڕۆیشتین. بەدەم گازندە و سکاڵاوە: هەر نەگەیشتین؟ وەڵامی دامەوە: با گەیشتین، هەر نەختێکی تر و دەگەین. هەر دوو نهۆممان ماوە و ئەوجا پلیکانەیەکی تر کە بەرەو هەورەبانەکە دەچێت و ئێمەش لە هەورەبانەکەدا دەژین.

بەلای زۆر دەرگای بێدەنگ و کشوماتدا، کە تابلۆی ناوی خاوەنەکانیان وەکوو زێڕ لەسەریان دەدرەوشانەوە و ناوەکانیشیان کە بە پیتی زۆر تەنک لەسەریان هەڵکەنرابوون و مینا گژوگیای ڕەش پێچیان خواردبوو، ڕەت بووین. کە لە دیوارە نیوە هەڵچنراوەکەی لای شانمەوە سەرم بەرەوخوار شۆڕ کردەوە، هێندە قووڵ بوو قاچەکانم ترس و لەرز دایگرتن و خۆم گەیاندە بەری ئەوبەری پلیکانەکان، بەڵام لەوێش پەنجەرەکان هەبوون کە نیگاکانیان بەرەو قووڵایی کۆڵانەکەی پشتماڵەوە هەڵمژیم. بە وریاییەوە خۆم لە ناوەڕاستی پلیکانەکان توند کرد و بەرەوژوو کەوتمە ڕێ.

بە کەیف و خۆشییەوە وتی: وا گەیشتین! و بەسەر پلیکانە بچکۆلەکەدا بەرەو هەورەبانەکە سەرکەوتین. هەورەبانەکە لە چەند ڕاڕەوێکی تاریک و درێژکۆلە پێکهاتبوو و ڕێک لەو جێگایەدا کە یەکێک لە ڕاڕەوەکان قۆڵی چەماندبووەوە، لەوێدا دەژیاین. لەسەر دەرگاکەمان نووسرابوو: (ی. پ. یێنسن.) تابلۆی ناوەکەی ئێمە لەوانەی تر نەدەچوو و لە جۆرە شووشەیەکی سپیی تایبەت بوو. ئەو کلیلەکانی لە گیرفانی دەرهێنا و دەرگاکەی کردەوە و چووینە ژوورەوە.

زۆر بەختیار بوو. بە خۆی و بەختیەوە بە ژوورەکەدا باڵەفڕێی دەکرد. بەختیارییە نوێیەکەی ئەو، من بووم. زۆر زۆرم خۆش دەویست، بەڵام هەرچییەکم دەکرد و چۆنم دەخواست نەمدەتوانی وەڵامی ئەو دڵخۆشییەی بدەمەوە و بەشداریی بکەم. هەر هێندەم پێ کرا لەسەر کورسییەک دابنیشم و لە ناخەوەش بگریم و تاسە و ئارەزووی گەڕانەوە بۆ خانەی منداڵانیش بەرۆکی بەرنەدەدام و بیری ئەوێم دەکرد.

دەرگاکەمان کرایەوە و (ی. پ. یێنسن) خۆی کرد بە ژووردا. کراسێکی سپی و پانتۆڵێکی لە بەردا بوو، کە قۆپچەکانی نارێکوپێک داخرابوون. بە ڕووخۆشییەوە دەستێکی بە ڕوومەتمدا هێنا و وتی: بە خێر بێیت بۆ ماڵە تازەکەت. لە بەرانبەر ئەودا خۆم بە غەریب دەهاتە پێش چاو و لە ئاست دەستیدا نەختێک بەرەودواوە سڵەمیمەوە.

دەستەکانی (ی. پ. یێنسن) زۆر زۆر سپی و کونج کونج بوون، ڕێک وەکوو شۆربای برنج کە دارچینی بەسەردا کرابێت و، تا لە تواناشمدا بوو خۆم لەو دەستوپلانەی دوور خستەوە. ژنەکەشی بەختیار و دڵخۆش لە تەنیشتیەوە ڕاوەستا بوو. ئەمم زۆر بە دڵدا چوو و زۆر خۆشم ویست و قەتیش فێری ئەوە نەبووم (ی. پ. یێنسن)م خۆش بووێت.

بەدەم گۆرانیوتنەوە بەنێو ئەو جلوبەرگانەدا، کە لە خانەی منداڵان وەرمانگرتبوون، دەگەڕا و یەک لە دوای یەک پارچە خراپ و بێکەڵکەکانی جیا دەکردەوە. هیچ سنوورێکی بۆ ئەو شتە تازانە نەهێشتبووەوە کە بە زووترین کات وەریاندەگرم و وتی: لە سبەینێ درەنگتر نییە، دەچین و دەیانکڕین! دەنگە ڕوون و بەکەیفەکەشی بوێرانە لەگەڵ گریانەکەی نێو ناخی مندا دەستویەخە بووبوو. ئەو ژوورە نوێیەی کە تێیدا

دانیشتبووم هیچ کاریگەرییەکی لەسەر من نەبوو. سووک و ئاسان نەمدەبینی و هیچ جێیەکی بۆ پڕ نەکردبوومەوە. تەنیا ژوورێکی خەمبار و کشومات و گەورە لەنێو ناخمدا هەبوو و بۆشاییەک کە تا دەهات گەورە و گەورەتر دەبوو و تا ئەو جێیەی کە ئیتر خۆم پێ ڕانەگیرا و بە دەنگی بەرز دەنگم بە گریان و ناڵین کرد.

وەک ئەوەی داوای لێبووردن بکات، بە (ی. پ. یێنسن)ی وت، کە لەو کاتەدا نەختێک نارەحەت بووبوو و هەڵسا و چووە ژوورێکی ترەوە: بێگومان کچەکەمان ماندووە و بیری هاوڕێکانیشی دەکات. بە ڕووخۆشیشەوە ڕووی لە من کرد و لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو: دڵنیابە، کە هەر لە سبەینێوە هەموو شتێکت لا خۆشتر دەبێت و ئەگەر حەزیش لەوە نەکەیت لای ئێمە بمێنیتەوە، ئەوا دەتوانیت بۆ خانەی منداڵان بگەڕێیتەوە و بەڵام، هەر چۆنێک بێت، پێش ئەوە دەبێت جووتێک گۆرەوی سوورت بۆ بکڕین.

هەر بەو دوو گفتەوە، کە وەکوو دوو چرای پرتەپرتکەر کە بە کزی لەو تاریکییەدا داگیرسابوون و بە تاسە و ئارەزووی خانەی منداڵان و ئەو ترس و لەرزەوە کە لە بەرانبەر ئەو دنیا تازە و نادیاردەدا کە ڕووبەڕووی بووبوومەوە، چاوەکانم چوونە خەو و خەوم لێ کەوت.

***گەڕان*** بەنێو فرۆشگاکەدا هیچ خۆش نەبوو! سەرەتا دەبوو لە دەروازەیەک کە بە دەوری خۆیدا دەخولایەوە ڕەت بیت، دەروازەیەک کە چوار باڵی هەبوو و باڵەکانی بەلەز و خێرا، وەکوو پەروانەی ئاشێک، دەخولانەوە و ناشزانم چەند جار و چەندێ لەنێویدا مامەوە و بە دەوریدا خولامەوە تا دەستی لێ گیر کردم و بۆ لای خۆی ڕاکێشام، بەڵام ئەوەندەی خایاند کە ترس بەوەدا ڕابگات بە برووسکەکەی خۆی لە پەلوپۆم بخات. ئەو لەگەڵ خۆیدا ڕاپێچی کردم و منیش وەکوو بووکەپەڕۆینەیەکی شلومل و بێ ئێسک و پرووسک دوای کەوتبووم. بەنێو کۆڵانی تەنگەبەر و درێژ درێژدا کە بەو مێزانەی شتیان لەسەر دانرابوو دروست بووبوون دەیهێنام و دەیبردم. لە هەموو لایەکیشەوە بێ سەر و بەر شتومەک لەسەر مێزەکان دانرابوون، شتومەکێکی هێندە زۆر و زەبەن کە قەت پێشتر نەمدیبوون و منیش بە دەمی داپچڕاوەوە، وەکوو ئەوەی چاوەکانم هێندە گەورە نەبن بەشی ئەوە بکەن ئەو شتگەلە بەدی بکەن، تەماشام دەکردن.

لەو کۆڵانەدا، کە ئەمبەر و ئەوبەری لە تۆپەقوماشی لەسەریەکهەڵچنراو پێکهاتبوو، ڕاوەستاین و ئەو دەستی کرد بە قسەکردن لەگەڵ ئەو ژنەدا کە لەودیوی مێزەکەوە ڕاوەستابوو. تەنیا سنگ و بەرۆک و دەموچاوی لە منەوە دیار بوون. چاڵێکی لەنێوەڕاستی سنگیدا هەبوو و بە لایەکیەوە مقەستێکی بریقەدار و، بە لایەکەی دیکەشەوە سەرینۆکەیەک کە دەرزیگەلێکی تێ چەقێنرابوو، هەڵواسرابوو. لووتیشی هێندە چرچولۆچی گەورە گەورەی تێدا بوو کە پێت وابوو بە دەرزیی سەرخڕ دەرزیئاژن کراوە.

ئەوان بەو بەرزییەوە وەستا بوون و دەستیان لە

پارچەقوماشەکان دەدا و منیش لەم خوارەوە بۆنم بە قوماشەکانەوە دەکرد و هەرنا و بە پەرۆشەوە بە زمانی مەتر و سەنتیمەتر کەوتنە یەکتر دواندن و ئەو ژنەش کە لەودیو مێزەکەوە ڕاوەستابوو، هاتە دەرەوە و پارچەقوماشێکی لوولکراوی زەردی کردەوە کە خەت خەتی ڕەشی لەسەر بوو و ئەوجا قۆڵێکی بەرز کردمەوە و سەرێکی پارچەقوماشەکەی کرد بە بنباڵمدا و تا سەر ئانیشکم درێژی کردەوە، پاشان لە ژێر چەناگەمی توند کرد و تا سەر ئەژنۆکانم بەری دایەوە و دوای ئەوانەش پێچێکی بە دەوری کەمەرمدا پێ دا و بەردەوامیش هەر بە زمانی مەتر و سەنتیمەتر لەگەڵ یەکتردا دەدوان و ئەوجا بۆ ئەودیوی مێزەکە گەڕایەوە و تۆپەقۆماشێکی لەسەر مێزەکە کردەوە و چیلکەیەکی هێنایە پێشەوە و چوار جار بەسەر قوماشەکەدا بازی پێدا و پاشان مقەستەکەی لە بەرۆکی کردەوە و ئەویش وەکوو ماسییەکی زیندوو بەخۆشییەوە بەنێو قوماشەکەدا کەوتە جووڵە. پاشان پارچەیەکی لە تۆپەکاغەزەکەی بەردەمی کردەوە و قوماشەکەی تێدا پێچایەوە.

بەرەو مێزێکی تر چووین و جلوبەرگی ژێرەوەمان کڕی. ژێرکراسەکان بە قۆپچەی لە ئێسک دروستکراوی سپی دادەخران، لە خانەی منداڵان بە قۆپچەی لە مێتاڵ دروست کراو دامانددەخستن. گۆرەوی تا سەر ئەژنۆ درێژیشی کڕی، گۆرەویی سووریش، بەڵام ئەوەندە جووتەگۆرەوی کڕی کە هیچ جێگایەکی بۆ شادی و خەنیبوون بۆ گۆرەوییە سوورە تا سەر ئەژنۆ درێژەکان نەهێشتەوە.

پاشان چووین بۆ بەشی یاریی منداڵان، بەڵام لەوێ ئەوەندەی شت لێ بوو کە دەمویستن و ئەوەندەش زۆر بوون

که قەت بە چاوی خۆم شتی وام نەدیبوو و بە جۆرێک کە هیچ کامێکیان بەر دڵم نەکەوت و پەنجەم لەسەر هیچیان دانەنا. ئەو میزەڵدانێکی شینی بۆ کڕیم و وتی: ئاگات لێ بێت لە دەستت بەر نەبێت! منیش هێندە توندوپڕ پەنجەکانم لە دەزووە نادیارەکەی گیرکردبوو کە ئازار و ئێشیان پێ کەوتبوو.

ماندوو بووم، هێندە ماندوو کە دەمویست پێڵووەکانم لێک نێم و یەکەوڕاست خەو دایگرتم، بەڵام ئەو بە دوای خۆیدا کێشی کردم و بەو کەیف و خۆشییەی خۆیەوە دەیویست چاو بە هەموو شتێکدا بگێڕم و گشت شتێک ببینم. دوای هەموو ئەمانە چووینە بەشی پێڵاو و لەسەر کورسییەک دایاننیشاندم و کارمەندی بەشەکەش یەک لە دوای یەک پێڵاوی لە پاکەتەکان دەردەهێنا و پێڵاوەکانیش لەنێو تەنکەکاغەزی نەرمونیانی پاکەتەکاندا لێی ڕاکشابوون و زۆر پێڵاوی پێ تاقیکردمەوە و بە دەستی بە بنی پێڵاوەکانیدا دەکێشا. هێندە ماندوو بووم کە نەمدەتوانی یارمەتی بدەم و پێیەکانیشم وەکوو بەرد لاڵ و قورس بووبوون و بێجگە لەوەش بەتەواوی بە میزەڵدانەکەمەوە خەریک بووم و، چونکە چەند جارێک خەریک بوو لە دەستم بەر ببێت و بکەوێتە دەم هەوا، هەوڵم دەدا لە دەستم بەرنەبێت. هەردووکیان وتیان: بزانە دەتوانیت پێیانەوە بڕۆیت! هەستامە سەر پێ و پێڵاوەکان قاچیان گرتم، بەڵام هێندە ماندوو بووم کە نەتوانم پێیان بڵێم قاچم دەگرن و هەردووکیان، ئەویش و کارمەندەکەش، لە کارەکەیان ڕازی بوون و بە کارمەندەکەی وت: ئەم جووتەمان دەوێت و بێگومان منداڵەکەش دەیەوێت جووتە تازەکانی لە پێدا بێت و ئەگەر زەحمەت نەبێت

کۆنەکانمان بۆ بپێچەرەوە. ئەوجا بەو پێڵاوە تەسکانەوە و بە مــــیـــزەڵدانێک و ترسی ئەوەوە لە دەســـــتم بەر نەبێت، فرۆشگاکەمان بە جێ هێشت.

بەڵام لە دەرەوەی فرۆشگاکە ئەوەندە سەروسیمای خەڵکی نەدیو و نەناسیاو بە لامدا تێپەڕین، کە ترسام و دەستم لە پەتی میزەڵدانەکەم شل بوو و ئەویش هێدی هێدی بەسەر ئەو حـــەشــــامــــاتەدا بەرەو ئاســــمــــان بەرز بووەوە. ئەو هەر ڕایدەکێشام و بە پێکەنینیشەوە وتی: دە برۆ دەی، دەبووایە پەتەکـــــــەیت توندتر بگرتایە، بەڵام وەرە با بچین بۆ قاوەخانەیەک و شۆکولادت بۆ بکڕم. بە بێدەنگی دوای کەوتم. دەمێک بوو فێری ئەوە بووبووم کە بە بێدەنگی بۆ شتە لەدەستچووەکانم بگریم.

قاوەخانەکە نیوەتاریک بوو، دووکەڵی ڕەش و شینباوی جگەرە بە لای دەموچاوماندا ڕەت دەبوو و پاشان لە ڤاڵاییدا دەتوایەوە و لە چاو ون دەبوو. ئەو پیاوەش کە ڕۆبێکی سپی لەبەردا بوو، لەم مــێــزەوە بۆ ئەو مــێــز دەچوو و لەگــەڵ هەمووانیش قسەی دەکرد، لە دواییدا هات بۆ لای مێزەکەی ئێمە و لە کووپی وا قووڵ و گەورەدا کە دەموچاومانیشی تێدا دەخنکا شۆکولادی بۆ هێناین و لەسەر شۆکولادەکەش وردە قووی سپی و بچکۆلەی لە کەفی شیری چەور دروست بوو مەلەیان دەکرد. کێکەکەش بە کەرەی سپیی شیری چەور سواخ درابوو و لەنێویشیەوە چەند چاوێکی سووری لە مرەبا سەیریان دەکردین و هەرچەندەش زۆر ماندوو و ناڕەحەتیش بووم، بەڵام لە کاتێکدا کە بۆی باس دەکردم کە کاتێک چووینەوە بۆ ماڵەوە سوپاسی (ی. پ. یێنسن) بکەم و دەست لە ملی بکەم و ئەملاولای ماچ بکەم بۆ ئەو هەموو شتانەی وەرمگرتبوون، وای لێ کردم کە دوو پارچە لە کێکەکە بخۆم.

پەرێشـان بووبووم و لە ناخمـەوە ئاوازێک بەرز دەبووە: ناتوانم! ناتوانم! حـەزم لە چارەی نیـیـە و قـەتیش ناتوانم مـاچی بکەم. دوای مــاوەیەک بە بێـدەنگیی بیــرکــردنەوە، وتم: ناچارم ئەوە بکـەم؟ وتـی: چـی بکـەیت؟ وتم: "ســـــوپـاسـی *(ئـەو)* بـکـەم!" بەسەرسوورمانەوە سـەیرێکی کردم: بێگومان و ناشبێت ئیتر بەو بڵـێیت: *(ئەو)*. لەمـەودوا دەبێت خـۆت فـێر بکەیت پێـمـان بڵێیت: دایە و بابە. وشـەی دایک و باوک لە جێی خـۆم سـڕیان کـردم. بـە چپـەوە بە خـۆم وت: قـەت ئەوە نـاکـەم، قـەت قـەت! بە لانی کەمەوە بەرانبەر بە *(ئەو)*. حەزم لە چارەی نییە و بڕایەوە. بە گشت پاکەتەکانمانەوە سواری ترامەکە بووین و من نـاڕەحەت بووم و دڵم تێکەڵ دەهات و بـە درێژایی ڕێگـاکـەش هـەر بیــرم لە دەســتلەملکردن و مــاچکردنی *(ئـەو)* دەکــردەوە. ئەوە نــاکــەم، نایکەم و بڕایـەوە! هـەر لەو کـاتەشـدا هێندەی تر دڵم تێکەڵ هات و ناچـار بووین بەوەی لـە وێســتگەیەک دابەزین و هـەر لـەگــەڵ دابەزینیشدا، دڵم هێندەی تر تێکەڵ هات و ڕشامەوە.

بەڵام *(ئەو)* لە ماڵەوە نەبوو. ئەم سـەیری کاغەزێکی بچکۆلەی کـرد و وتـی: چووە بۆ ئیش! لەبەر ئەوەش کـە بۆم نەبوو بە *(ئەو)* بـانـگی بکـەم، بۆشـم نەبوو بـپــرسـم: ئەی *(ئەو)* کــەی دێتــەوە؟ لەبری ئـەوە وتم: بە درێژایی ڕۆژەکــە هـەر بە تەنـیـا خـۆمــان لە ماڵەوە دەبین؟ ئەو لێم تێنەگەیشت و پێی وابوو کـە بیر و خەیاڵم لای ئەوە و بیـری دەکەم. دڵـی دامـەوە و وتـی: سـبـەینـێ، سـبـەینـێ دێتەوە و بە درێژایی ڕۆژیش هـەر لە ماڵەوە دەبێت.

**بۆ سبەینێ** یەکەم شت کە چاوم پێی کەوت، جلوبەرگە تازەکانم بوو کە لەسەر مێزەکە بڵاو کرابوونەوە و یەکسەر ئەوەم بیر کەوتەوە کە دەبێت سوپاسی بکەم و ئەوەشم بیر کەوتەوە کە ئەو ڕۆژە لە ماڵ دەمێنێتەوە و ناچێتە سەر کار. چاوم داخستەوە و خۆم کردەوە بە نووستوو. خاڵۆژنەکەم ئەوکاتە هەڵسا بوو و لە موبەقەکەدا تەقەتەقی بەو کوپانە خستبوو کە قاوەمان تێدا دەخواردەوە و هاتە ژوورەکە و سفرەی ڕازاندەوە و بانگی ئەوی کرد. بە خۆی و چاوە سووره نیوەکراوەکانیەوە خۆی بە ژووردا کرد و بەملا و ئەولایدا دەیڕوانی. هەر کە خاڵۆژنم گەڕایەوە بۆ موبەقەکە، بەپەلە لە جێگاکەم هاتمە دەرەوە و چوومە لای ئەوەوە، دەستیم گرت و خۆم بۆ چەماندەوە و سوپاسم کرد. ئەویش دەستێکی بە ڕوومەتمدا هێنا و وتی: تۆ دەبێت هەر بۆ خەڵکی غەیرە خۆت بچەمێنیتەوە! ئێمە کەسی تۆین و غەیرە نین، من باوکتم و ئەویش دایکتە و هێندەش نابات فێر دەبیت بە دایە و بابە بانگمان بکەیت.

لەگەڵ قاوەکەدا جۆرە نانێکی تایبەت و گەرموگوڕ و گەورە گەورەی بۆ دانایین و، بە کەرە کە وەک پەڵەیەکی ڕەش بەناو نانەکاندا داچۆڕابوو سواخ درابوون. ئەو نیوەیەی نانەکە کە لە بێشکەیەک دەچوو ئەوەندە خۆش دیار بوو کە یەکسەر ددانەکانم تێ گیرکردن و یەکسەریش بێدەنگی و کشوماتی مێزەکەمانی داگرت. خاڵۆژنم وتی: قەت نابێت ئەو نانەی کە لە سەری سەرەوە دانراوە بخۆیت، کاتێک باوکت لەگەڵمان دانیشتووە. چونکە ئەو بە تەنیا حەزی لەوەیە و هەر ئەویشە کە پارەمان بۆ پەیدا دەکات، هەربۆیە باشترین شتێک کە لە ماڵماندا هەیە دەبێت بەر ئەو بکەوێت. بە ترسێکەوە نانەکەم لە جێی خۆی دانایەوە، بەڵام ئەو وتی: تازە مادام لێت

خواردەوە، دەبێت تەواویشی بکەیت! نانەکەی بۆ درێژ کردم و بە نیگایەکی هێندە ڕەش و تاریکەیشەوە سەیری کردم کە هیچ حەز و ئارەزوویەکم لێی نەما.

دوای قاوەخواردنەوە، سەرتاپا جلوبەرگە تازەکانمی لەبەر کردمەوە و، کاتێک بەتەواوی هەمووانی لەبەر کردم، لە نێوەڕاستی ژوورەکەدا دانام، خۆم وەکوو ئەو بووکۆکانە دەهاتە پێش چاو کە لەنێو جامخانان دادەنرێن و ئەوانیش بە خۆشییەوە سەیریان دەکردم. هیچ پارچەیەک لە جلەکانی خانەی منداڵانم لە بەردا نەمابوو. بە لاچاو تەماشای جلوبەرگەکانی خانەی منداڵانم کرد و بە ئاواتی ئەوەوە بووم هەر هیچ نەبێت ڕێیان بدامایە پارچەیەک لەو جلە کۆنانەم لەبەر بکردایە: بۆ نموونە ژێرکراسەکەم. پێم وابوو ئەگەر وا بووایە زیاتر هەستم بە ئازایەتی و بوێری دەکرد.

خاڵۆژنم بە خۆشییەکەوە وتی: دەی بڕۆن و تا خوانی نیوەڕۆ ئامادە دەبێت پیاسەکی دوورودرێژ بکەن! و بە کەیفوخۆشییەوە سەیرێکی من و ئەویشی کرد. (ی. پ. یێنسن)، چاکەتێکی مۆری ڕەشباوی کرد بەسەر جلەکانیدا و گۆچانێکی کەمەزیوینی کرد بە قۆڵیدا. دەستی گرتم و بە دوای خۆیدا بەنێو جادە دوورودرێژ و ناخۆشەکاندا کەوتینە پیاسە و گەڕان، کاتێکیش کە دەیویست سڵاو لە ناسیاوەکانی بکات، دەستی منی بەر دەدا و بەتەواوی کڵاوەکەی بۆ بەرز دەکردنەوە و هێندەش سەری بۆ دادەنەواندن کە پێم وابوو ئیتر جارێکی تر ئەو کڵاو و سەرە بە یەکتر ناگەنەوە. دەستم لەناو دەستیدا خۆش نەبوو. وەک ئەوە وابوو کە لە دەستکێشێکی گەورە ئاخنرا بێت و نەزانێت لە چ سووچێکیدا ئارام بگرێت و هەست بە دڵنیایی بکات.

قاچەکانم زۆر لە دوای ئەوەوە، هێندەی درێژیی قۆڵ و باسکی هەردووکمان پێکەوە، ڕێیان دەکرد. ئەو هەستی بە هیچ نەدەکرد. شانازی بەوەوە دەکرد کە لەگەڵ *(کچەکەیدا)* بە ڕێدا دەڕوات. ئەوجا بە ناسیاوێکی ناساندم کە لێی هاتە پێشەوە و لێی پرسیم.

هەر ئەوەندەی گەیشتینە بەردەم قاوەخانەیەک کە بیرەشی لێ دەفرۆشرا پێی وتم: تینووت نییە؟ و بە چاوەڕوانییەوە بە چاوە شینەکانیشی تەماشای کردم. بە سەر ئاماژەم بۆ کرد کە تینوومە و ئەوجا ڕایکێشامە ناو قاوەخانەکەوە و کەوتین بەسەر دووکەڵی جگەرە و دەنگی گڕی ئەوانەدا کە لەوێ دانیشتبوون. لە نێوەڕاستی قاوەخانەکەدا مێزێک دانرابوو و تەختەکەی سەری هێندەی چیمەنێکی تازەبڕدراو سەوز بوو، چەند پیاوێکیش بە خۆیان و قۆڵەهەڵکراوەکانیانەوە لە دەوری ڕاوەستا بوون و بە گۆچانی درێژ درێژ لەو تۆپە سپییانەیان دەدا کە بە بێدەنگی بەسەر فەرشە سەوزەکەدا گل دەبوونەوە و کاتێکیش بەر یەکتر دەکەوتن هەموو پێکەوە خورتە و بۆڵە و دەنگیان لێ بەرز دەبووەوە.

کە گەیشتینە لایان هاواریان لێ هەڵسا: ئەم کاتەت باش، یێنسن! و پرسییان: ئەی ئەم کچە قژکاڵە بچکۆلەیە کێیە لەگەڵتدا؟ بۆ لای مێزێکی بردم و ڕووی لەوان کرد و وتی: کچەکەمە! بە دەنگە گڕەکانیان دایانە قاقای پێکەنین و وتیان: ماڵت کاول نەبێت، چ زووو! تۆ تا دوێنێش کچت نەبوو. چییە بەرهەمی خەتایەکی گەنجانەیە؟ ئەویش بەسەریاندا قیژاندی: دەمتان داخەن! و هەمان نیگای ڕەش و تاریک، ڕێک وەک ئەو کاتەی کە نانەکەم هەڵگرت، سەروسیمای داگرت. کەمێک دواتر لێم پرسی: خەتای گەنجانە، یانی چی؟ ئەویش وتی:

سـەری خـۆت بـەو شـتـانـەوە مـەئێـشـێنە و، هەر ئەوسـاش مەیگێڕەکە هات و ئاوی لیمۆ بۆ من و شووشەیەکی سەوزی تۆخ کە لەسەری نووسرابوو (توبۆری) لە بەردەمی ئەوی دانا. کە ئاوی لیمۆکەی بۆ من کردە پەرداخەکەمەوە وەکوو خۆرێک کـە قـوولْپ بدات وا بوو و لەو شـووشـە تەلْخ و تاریکەشـەوە خواردنەوەیەکی زەردی قاوەییباو ڕژایە خوارەوە و تا دەهات لەناو لێوانەکەی ئەودا زیاد و زیادتر دەبوو و تا لە دواییدا وەکـوو ڕیشـێکی سـپی دەهاتە بەر چاو. بە گـرنگیـیـەکی تەواوەوە چاوم لە ڕیشە سـپـیـیـەکـە بڕیبـوو و زۆریش حـەزم دەکـرد لـەبارەیەوە لێی بپـرسم و دوای مـاوەیەک تێـڕامـان و وردبوونەوە لەوەی کـە چۆن بتـوانم خـۆم لە وشـەی مۆلْەتپێدراوی (باوک) و وشەی یاساخکراوی (تۆ) بدزمەوە، وتم: ئەرێ پیاو دەتوانێت ڕیش بخواتەوە؟ ئەو وتی: مەبەستت چییە، کچم! دەستم بۆ شتە سپییەکەی ناو پەرداخەکە درێژ کرد. دەستی بە پێکەنین کرد و وتی: ئەوە! ئەوە کەفی بیرەیە. و دەستی بە خواردنەوەی بیرە و کەفەکە کرد و پاشانیش بە کەفەکەی دەوری دەموپلیەوە ئەوەندە سەیروسەمەرە دیار بوو کـە نەمـتـوانی خـۆم بگرم و پێ نەکـەنم. هەر ئەوسـاش بە جـددییەکـەوە سـەیری کـردم و وتی: پیـاو بە باوکی خـۆی پێ ناکەنێت.

لە تەنیـشـت پەرداخی بیـرەکـەوە، پەرداخـێکی بچـووک دانرابوو. قـەت لەوەوپێـشـتـر پەرداخی وا بچکۆلەم نەدیبـوو، وەک گوڵەجەڕەس دەینواند و پڕ بوو لە ئاو. ئاوەکەی کردە ناو بیرەکەیەوە و، لە کاتێکدا کە بـە لاچاوێک سەیری میوانەکانی تری دەکرد، وتی: بیرەکە هێندە خەست و قورسە، کە دەبێت نەختێک بە ئاو ڕوونی بکەمەوە. یەکێک لە پشتی مێزەکەی

ئێمەوە دەستی بە حیلکەحیلک کرد و ئەویش بە تووڕەییەوە ڕووی وەرگێڕا و ڕووی تێکردن و وتی: کەس قسەیەکی هەبوو؟ بەڵام هەر یەکسەر بێدەنگی ئەو ناوەی داگرت و کشومات بوو. دوای ئەوەی بە تووڕەییەوە چاوێکی بەنێو مەیخانەکەدا گێڕا، وتی: هەستە با بڕۆین.

بڕیار بوو کە بچین بۆ لای نانەواکە و نانی تایبەت بکڕین تا بە چایی و قاوەوە بیخۆین. نانەواخانەکە کەوتبووە ژێرخانێکەوە و کاتێک دەرگاکەیمان کردەوە بۆن و بەرامەیەکی گەرموگوڕ بەرەو ڕوومان هات و بەرەو ژوورەوە ڕایکێشاین. هێندەی نان و شیرینییش، زەردەزیرەی لێ بوو و هەریەک لە نانەکانیش ناوی تایبەتی خۆیان هەبوو و هەر جارێکیش ئەو ژنەی لەودیوی مێزەکەوە ڕاوەستابوو یەکێکیانی هەڵدەگرت، گەواڵەیەک زەردەزیرە بەو ناوەدا بڵاو دەبووەوە. هەر لەو کاتەشدا لە ژێرخانێکی ترەوە، کە لەوی یەکەمیان قووڵتر بوو، نانەواکە بە خۆی و نانە برژاو و تازەکانیەوە هاتە دەرەوە و دەموچاویشی وەکوو سەمونێکی نەبرژاو سپی سپی بووبوو.

دوای دیدەنی نانەواکەش بڕیار بوو بچین و گوڵ بۆ (دایک)م بکڕین و ئەو وتی: دەبێت تۆ بیدەیتێ. چەند مەندیلانەیەکی کڕی، کە من حەزم لێ نەدەکردن. کاتێکیش هاتینەوە ماڵەوە و مەندیلانەکانم بۆ ڕاگرت و دامە دەستی، تەنیا سەیرێکی ئەوی کرد و وتی: بەڵام یێنسن، دیسان مەشروبی قورست خواردووەتەوە!؟ منیش وتم: نەخێر، *(ئەو)* مەشروبی قورسی نەخواردۆتەوە، بەڵکو تەنانەت ئاویشی کردە ناو بیرەکەیەوە. ئەوجا هەردووکیان دەستیان کرد بە پێکەنین. بەڵام پاشان بە تووڕەییەوە ڕووی تێکردم و وتی: من

*(ئەو)* نیم بۆ تۆ و منداڵیش نابێت خــۆی لە قـــســـەوباسی گـەورەکـان هـەڵقـورتێـنێت. کـاتێکیش ویسـتـمـان ئەو نـانانە بخـۆین کە کە کڕیبـوومـان، من حـەزم لە دانـەیەکی تایبـەتیـان بـوو، بەڵام هـەرزوو ڕووبـەڕووی نیـگـا تـاریک و ڕەشـــەکـــەی کــردمــەوە و هەر زووش لەوە تێگەیشــتـم کــە ئەو حــەزی لەو جـۆرەیانە. خـاڵۆژنم جۆرێکی تری بۆ ڕاگرتم و وتی: سـەیرکـە ئەمـیـان خـۆرێکی بچـکۆلەیش لـە ناوەڕاسـتـیـدایە. بەڵام من حەزم لەم جۆرەیان نەدەکرد کە خۆرێک لە ناوەڕاستیدا بوو.

***زۆر پەلەیان بوو***، پەلەیان بوو لەوەدا کە خۆشەویستیم بە دەست بهێنن. ئەوە ڕاستە کە من ماوەیەکی دوورودرێژ بە ئاواتی ئەوەوە بووم کەسانێک هەبن بە باوک و دایک بانگیان بکەم، کەسانێک هەبن بە هی خۆیانم بزانن، بەڵام ئێستا ئەو وشانە بە ئاسانی بە دەممدا نەدەهاتن. لە بەرانبەر خۆشەویستییە چڵێسەکەی ئەواندا کە هیچ وەختێکی بۆ خۆشەویستییەکەی من نەهێشتبووەوە، بەڵکو لە هەموو لایەکەوە پەلامارى دەدام و هەناسەی لەبەر بڕیبووم، دەسڵەمیمەوە.

هەموو شەوێک بەر لە نووستن خۆم لەسەر هەردوو وشەی: باوک و دایک ڕادەهێنا. ئەو وشانەی کە دەمانێکی دوورودرێژ بە ئارەزووی مانا و ناوەڕۆکیانەوە بووم و ئێستاش هێندە زەحمەت بوون کە نەدەکرا بیانڵێم و بە کاریان بهێنم.

بەڵام ئەوان چییان بکردایە لە کاتێکدا کە نەیاندەتوانی جێی ئەو کەسانە بگرنەوە کە خەونم پێوە دەبینن!؟ ئەی من چیم پێ دەکرا لە بەرانبەر ئەوەدا کە ئەوان دەمێک بوو بە ئاواتی ئەوەوە بوون کەسێکیان خۆش بووێت و منداڵێکیان هەبێت!؟ هەربۆیە لە دەوری یەکتر دەخولاینەوە و، بەبێ ئەوەی شێوەیەکی لەبار و گونجاوی وا بدۆزینەوە تاکو تێیدا بە یەکتر بگەین، تاسە و ئارەزووی هەمان شتمان دەکرد.

ڕۆژێکیان خاڵۆژنم بەوپەڕی شادی و خۆشییەوە بۆ ماڵ هاتەوە و وتی: ئیتر تۆ بوویت بە کچی ڕاستەقینەی ئێمە. تەنانەت پادشاش دانی بەوەدا ناوە و ئەوجا کاغەزێکی ئەستووری سپی پێشان دام کە لە ژێر ناوی من و ناوی ئەودا مۆری پادشایانەی لێ درابوو. ئەوەم هێندە بەلاوە گرنگ بوو کە تەنانەت پادشاش منی دەناسی، کە بۆ ماوەیەکی

دوورودرێژ  چاوم لە مـــێـــوی ســــووری ســــەر کـــاغـــەزەکـــە نەترووکاند. ئەویش لە خۆشیاندا هێندە شاگەشکە و دڵشاد بوو کە کاغەزەکەی لە دەست وەرگرتم و وتی: بۆ ئەوەی کەس دەستی پێ ڕانەگات، لەو جەکمەجەیەدا کە لە خۆمان نەبێت لە گشت کەسێک پەنهانە، دەیشارینەوە! ئەوجا ناوچەوانی ماچ کردم و دووبارەی کردەوە: ئێستا ئیتر تۆ کچی منی، کچی ڕاستەقینەی منی! من ئەوم زۆر خۆش دەویست، نەمدەتوانی خۆشم نەوێت و وردە وردەش دڵم بۆی کرایەوە و وەکوو دایکی ڕاستەقینەی خۆم تەماشام دەکرد، بەڵام نێوانەڕێییەکم هەڵبژارد و بڕیارم دا لەوەودوا بە (مووددی) بانگی بکەم.

***لە شاردا*** ئاسمان نییە. هەموو شتێک لە بەردە. بەرد بۆ پێیەکان. بەرد بۆ چاو. ئەگەر بکەویت، بەرد بۆ لەش. پێیەکان تووشی ئازار دەبن و چاویش، بۆ ئەوەی بە دوای ئاسمانێکدا بگەڕێن، بێهوودە، دەبێت بە دیواری خانووەکاندا هەڵزنێن.

لە شاردا، باران جیاوازتر لە دەرەوەی شار دەبارێت. بەردەکان ناتوانن بخۆنەوە، تەنیا ئەوەندە دەتوانن ڕێ بدەن بارانەکە بێباک بەسەر ڕوومەتە ڕەق و تەقەکانیاندا، بەرەو درزەکانی نێوانیان داچۆڕێت، بەڵام لە دەرەوەی شار، زەوییەکە، بە دەمولێوە تینووەکانی بارانەکە دەخواتەوە.

ڕۆژەکانی شار، لە ڕۆژەکانی دەرەوەی شار، کورتترن. کاتژمێرەکانی شار، ڕۆژ لەت لەت دەکەن، بەڵام لە دەرەوەی شار، ڕۆژ هێندەی ئەو پردە درێژە کە کازیوەی بەیان بە بووڵێڵەی ئێواران دەگەیەنێت، لەوێ گوڵەکان، دەم پڕ لە ئاوونگەئەستێرە، لە خەو هەڵدەستن، بەڵام لە شاردا گوڵەکان بە لارەملی لەنێو زیندانی پەنجەرەکاندا گەورە دەبن و ئێواران بە دوای ئەستێرەکاندا دەگرین. لە شاردا، درەختەکان لە ڕیزی نەبوونن و، چەند دانەیەکی پۆشتە و پەرداخ نەبێت، کە بەو ژنانە دەچن یەکشەممان خۆیان دەگۆڕن، هیچی ترت بەرچاو ناکەوێت. بەڵام لە دەرەوەی شار، پیاو ناچارە درەختەکان ببڕێتەوە بۆ ئەوەی ڕێ بۆ ژنە بەناز و فیزەکانی یەکشەممان خۆش بکات.

لە شاردا، خانووەکان زۆر بەرزن. شەقامەکان، وەک بناغەی زۆر قووڵ بەنێو خانووەکاندا ڕەت دەبن. لە دەرەوەی شار، مرۆڤ دەتوانێت سواری سەربانی ماڵەکان بێت و، ئەگەر لەسەر پەنجەکانی بوەستێت، دەتوانێت ڕاستەوڕاست لە پەنجەرەکانەوە بنوارێت. لە ماڵەکانی شاردا، پلیکانەکان

بێسنوور بەرەو بەرزایی هەڵکشاون، وا پێدەچێت مرۆڤ لەنێو قـاوغـی هێلکەشـەیتـانۆکـەیەکی زەبەلاحـدا بەردەوام لە هاتوچۆدا بێت. لە شـاردا، مـرۆڤ بەترسـەوە بەلای دەرگـا بێشـومارەکـاندا تێـپەڕ دەبێت، ئەو دەرگـایانەی کـە بوونەتە مـەنزڵی ترسـە گـەورەکـان. لە دەرەوەی شـار، مـرۆڤ تەنـیا دەچێتە ژوورەوە و، یەکسەر، خۆی لەنێو ماڵەکەدا دەبینێتەوە.

لە شـاردا، کـەرەسـەکـانی هاتوچـۆکـردن زۆر لە مـرۆڤ گـرنگتـرن. ئەسـپـەکـان، هـەمـیـشـە بەرەوپێش و بە لاچاوەکانینانەوە، ڕێ دەکەن. زیاتر لە دوو دەقیقەش، کچێکی بچکۆلەی لادێی ناتوانێت بێـباکانە لەگـەڵ خـەونەکـانیدا ڕێ بکات، بەر لەوەی ئۆتـۆمـۆبیلەکـان بێن و بە دەنگی هـۆڕنە ڕەشـەکـانیـان خـەونەکـانی تێکوپێک بشکێن. لە شـاردا، بایەکـان، وەک ئەوەی کـە خـۆیان خـۆیان هەڵلووشـیـبـێت، هەرگیـز لە گڤـەگڤی خـۆیان ناکەون، لە پێـچی کۆڵانەکـاندا خـەونێکی سـووک چاوەکـانی قـورس کـردوون و، لەپڕێکدا پەلامـاری کەسـێک دەدەن و جلوبەرگ و قژی تێک دەدەن، بۆ ئەوەی پاشان بە هەمان کتوپڕی ون ببنەوە. لە دەرەوەی شار، مرۆڤ دەتوانێت بۆ چەندان ڕۆژ پێشبڕکێ لەگەڵ بادا بکات.

لە شـاردا، مـرۆڤ دەبێت پێـڵاوی لە پێـدا بێت. لە دەرەوەی شار، گژوگیا پێڵاوی پێیەکانن.

هیچ شـتێک سـەرەتا و کۆتایی نییە لە شاردا. پلیکانەکان بە هـەمـان شـێـوە کـە بەرەو بەرزایی هەڵکشـاون، بەرەو نزماییش داکشاون. ئەگەر مرۆڤێکی هەژار ببینیت، هەر زوو چاوت بە مرۆڤـێکی لەو هەژارتر دەکەوێت و، هـەمیشـە دوای ئەو گـالیسکەیەش کە زیووی هەڵگرتووە، ئەو گـالیسکەیە دێت کـە ئاڵتـوونی لێنراوە. درزی نێـوان بەردە لە پاڵ یەکـدا

ڕیزکراوەکانی سەر شەقامەکان، دەماری ئاڵتوونیی شارن. پیاو لەوێدا هەموو شتێک دەدۆزێتەوە: قۆپچەیەکی بریسکەدار، سەرەقەڵەمێک، تۆپێکی نیوەمردووی دەرزیئاژنکراو، وێنەیەکی بەشەوق، بووکەپەڕۆینەیەک یان پارەیەکی سەوزی کەڕووگرتوو.

لە شاردا، خەڵکی سڵاو لە یەکتر ناکەن. تەنیا، وەک بای نەبینراو بەلای یەکتردا ڕەت دەبن. لە شاردا، مردووەکان گوڵەکانیان لە زیندووەکان دزیوە.

لە شاردا، مرۆڤ لە ژێرخان و لە هەورەبانیشدا دەژی و، ئەوانەی لەوێدا دەژین پێوەندییەکی توندوتۆڵ لەنێوانیاندا هەیە دژی ئەوانەی لە نهۆمەکانی تردان و، لەوان خۆشتر دەژین. لە ژێرخان و هەورەبانەکاندا زەنگ نییە: لەوێ ناچاریت لە دەرگا بدەیت. ئاودەست نییە: دەبێت بچیتە دەرەوە. هەندێک پێیان وایە خۆشترە لە هەورەبانەکاندا بژیت وەک لە ژێرخانەکاندا، بەڵام من، لەبەرئەوەی خۆم لە هەورەباندا دەژیام، هەمیشە لەو بڕوایەدا بووم: ژیان لە ژێرخانەکاندا خۆشترە.

***ئەو هەورەبانەی ئێمەی تێدا دەژیاین***، باسکێکی چەماوەی لەنێوان دوو خانووی گەلێک خۆشی نهۆمەکەدا درێژ کردبوو و ئێمەش ڕێک لەو جێیەدا کە بە ئانیشکی ئەو باسکە درێژکراوە دەچوو، دەژیاین. دوو ژوورمان هەبوو و لەگەڵ ئۆدەیەکی لەوان بچووکتر، کە ناومان لێ نابوو: موبەق. هەر سێ ژوورەکەش، ڕۆژێک لە ڕۆژان، هەورەبانی خانووەکانی دیکە بوون.

ئاومان نەبوو، گازمان نەبوو، کارەبامان نەبوو، ماڵەکەمان وەکوو ماڵەکانی دیکە گەرم نەدەکرا و ئاودەستیشمان نەبوو. بەڵام هەر نهۆمێک خوار ئێمە گشت ئەو شتانەیان هەبوو، کە ئێمە نەمانبوون! (موددی)ش دەیوت: ئەوانەی لە نهۆمەکانی تردا دەژین، خەڵکی نەجیبزادە و خواپێداون و زۆربەشیان سەر بە خانەوادە ناسراو و بەناوبانگەکانی شارن و جارناجارێکیش گالیسکەی تایبەتی شایانە دێن بە دوایاندا و بۆ قەڵای پادشایان دەبەن.

ئاومان لە سەری ئەوسەری ئەو ڕاڕەووەوە دەهێنا کە هەورەبانەکەمانی کەوتبووە سەر. ئاودەست، پێنج نهۆم لە خوارەوە، کەوتبووە ناو حەوشەی خانووەکەوە. ڕووناکیمان لە چراوە وەردەگرت. گەرمیشمان لە کوانوویەکەوە وەردەگرت کە دەبوو بەردەوام جۆرێکی تایبەت لە خەڵووزی بەردینی تێبئاخنین و ئەویشمان لە ژێرخانێکی تاریکونوتەکەوە دەهێنا کە شەش نهۆم لە خوار خانووەکەمانەوە بوو و بووبووە مەنزڵگەی گشت پشیلەکانی گەڕەک.

ژیان لە هەورەبانێکدا ڕۆژانە هەر چۆنێک بوو دەچووە سەر، بەڵام هەر کە دەبووە ئێوارە و شەو ئیتر زۆر زەحمەت بوو بەرگەی ئەو ژیانە بگریت. ئای کە دەترسام کاتێک

(مـوددی) بە ڕاڕەوە دووروودرێژ و تاریکەکـەدا دەڕۆیشت بۆ ئاوهێنان! ئەگەرچی هەر جارێکیش کـە دەڕۆیشت مۆمـێکی لەگـەڵ خـۆیدا هـەڵدەگـرت، بەڵام پرتـەپرتی گـڕی مـۆمـەکـە هێندەی تر ڕاڕەوەکـەی ترسناک دەکـرد: تاریکایی پشت و تاریکایی پێشی ڕووناکیی مۆمەکە هێندەی تر تاریک دەبوو. ئەی ئەوە کێ بوو کە فووی لە گڕی مۆمەکە دەکرد و وای لێ دەکرد جارێک بەملا و جارێکی دیکە بەولادا بچەمێتەوە و بە کوژانەوە هەڕەشەمان لێ بکات؟

چونکە (مـوددی) بە دەسـتـێک مـۆمـەکـەی دەگـرت و بە دەستەکەی تریشی ئاگرەکەی دەپاراست تا نەکوژێتەوە، هیچ جێیەک بۆ دەستە ترساوەکەی من نەمابووەوە تا خۆی تێدا پەنا بدات. لەبەر ئەوە بە دەستێکم پڕم بە تەنوورەکەیدا دەکرد و دەستەکەی دیکەشم لە بنباڵمدا دەشاردەوە.

هەموو شتێکم لە دەست دەهات بۆ ئەوەی خۆم بخزێنمەوە ناو (مـوددی)یەوە، نەمـدەزانی لە پێشـەوەی دڵنیـاترە یان لە تەنیشـتـەوە، ئەگـەرچی هەرجـارێکیش کـە ئاوڕم بۆ دواوە دەدایەوە خـەریک بـوو لە ترسـاندا دەبووڕامـەوە، بەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا ناچار بووم ئاوڕ بدەمـەوە تا بزانم: کـەس دوامـان کەوتووە یان نا!

بەڵام نـەمـدەوێرا بـە تەنیـا، کـاتێک کـە (مـوددی) دەچووە دەرەوە، لە ژوورەکەدا بمێنمەوە. ئەگەر ناچار بووایە بچێت بۆ ئاودەست، نیوەی شەویش بووایە، تا حەوشەکە دوای دەکەوتم و تـەنیـا و ترسـاو لەو حـەوشـە تـاریکەدا، لە بەردەم ئاودەستـەکەدا، نزیک لە دەرگاکەی ڕادەوەستام و چاوەڕێی (مـوددی)یم دەکرد.

هەندێ جار حەوشەکە بە ڕووناکیی یەکێک لە پەنجەرەکان ڕۆشن دەبووەوە، بەڵام هەر ئەوەندە ڕووناکییەکە دەکوژایەوە

ئیتر حەوشەکە هێندەی تر تاریک دەبوو و منیش ناچار بەدەم سکاڵا و گازندەوە هاوارم لە (موددی) دەکرد و داوام لێ دەکرد پەلە بکات.

ئەو کوختەی جلوبەرگمان تێدا دەشت کەوتبووە ناو حەوشەکەوە و (موددی) تەنیا ئێواران درەنگانێک دەیتوانی بە کاری بهێنێت، چونکە ڕۆژانە تەرخان بوو بۆ شتن و پاککردنەوەی جلوبەرگی خواپێداو و نەجیبزادەکان.

ئەو ئێوارانە لە کوختەکەدا لە لای (موددی) لەسەر کورسییەک دادەنیشتم. لەسەر کورسییەک کە هێندەی قاچی ئاسنینی ئەو تەشتە زەبەلاحانە بەرز بوو کە جلوبەرگەکانمانی تێدا دەشت و قاچم بۆ سەر پلەیەک، کە دوو پێچکەی پێشەوەی کورسییەکیان ڕاگرتبوو، درێژ دەکرد. دەموچاوم دەخستە نێو هەردوو لەپی دەستەکانمەوە و بەدەم خەون و خەیاڵاتەوە لەو پشکۆیانە ورد دەبوومەوە کە لە ژێر مەنجەڵی ئاوگەرمکردنەکەدا دەگڕان و جارناجارێک لە کاتێکدا کە وردەی سپیی خۆڵەمێشیان لێ بەرز دەبووەوە، ڕەنگیان دەگۆڕا و ڕەش دەبوون، سوور دەبوون، ڕەش دەبوون و سوور دەبوون.

گوێم لە خوڕەی ئاوی بەلوعەکان، لە دەنگی قوڵپەقوڵپی ئەو ئاوە گەرمەی جلەکانی تێدا دەکوڵێنرا و لەو لوورەلوورە دەگرت کە ئاگاداری دەکردینەوە لەوەی ئاوەکە خەریکە زیاد لە پێویست دەکوڵێت، هەروەها گوێم لە لە شڵپەی ئاوی کوڵاو، کە دەڕژایە سەر زەوییە چیمەنتۆکەی کوختەکە، دەگرت. کە (موددی) سەری مەنجەڵەکەی هەڵدەدایەوە، دیمەنی جلوبەرگەکان کە پڕ بووبوون لە بڵقی گەورە گەورەی سپی زۆر ترسناک بوو و کاتێکیش هەوڵی دەدا بە چیلکەیەک

بیانکاتەوە بە ئاوە گەرمەکەدا یەکسەر لە تەنیشتەوە بڵقی تازە دەردەکەوتن و لە جێی خۆیان بەرز دەبوونەوە.

دڵم تێکەڵوپێکەڵ دەهات، بەو هالاوەی کوختەکەی پڕ دەکرد و بەو بۆنە شیرینەی لە جلوبەرگە شۆردراوەکانەوە دەهات و هەندێک جار دوای ماوەیەکی کەم خەوم لێ دەکەوت، بەلام بە دەنگی شلپەی ئاوەکە کە بەر ئەرزی کوختەکە دەکەوت بە ئاگا دەهاتمەوە: دەنگی شلپەی ئاوی داچۆڕاوی جلوبەرگەکانمان، کاتێک (موددی) لە مەنجەڵە گەرمەکەوە بۆ ناو تەشتی لەئاوهەڵکێشانەکە دەیگواستنەوە. بە چاوی نیوەکراوەوە دەمبینی چۆن (موددی) بە دارێکی ئەستوور پارچەجلەکانی بەرز دەکردەوە کە هەڵمیان لێ هەڵدەستا و تا دەکەوتنە ناو تەشتی لەئاوهەڵکێشانەوەی تەنیشت مەنجەڵەکەوە پەردەیەکیان لە ئاو دروست دەکرد.

هەندێ جار ئەو ژنەی لە ژێرخانی تەنیشت کوختی جلشتنەکەوە دەژیا لە ئاستانەی دەرگاکەدا بە خۆی و سینییەک چاییەوە پەیدا دەبوو و منیش لەگەڵ پەیدابوونی ئەودا چاوەکانم دەکرانەوە و لە جێی خۆم قیت دەبوومەوە. (موددی)ش جلوبەرگەکانی بە جێ دەهێشت و دەستە سوور و هەلاوساوەکانی بەو بەرکۆشەی کە چەند جاران بە دەوری سکیدا لە خۆیەوە پێچابوو وشک دەکردەوە و بە خۆشییەوە لە ژنەکەی دەڕوانی و بە سوپاسەوە یەکی کوپێک چایی گەرم و کێکی تازەبرژاومان لەسەر سینییەکە هەڵدەگرت.

لە کاتێکدا من کوپە چایەکەم دەبرد، لە لایەکەوە لێ دادەنیشتم و هەستم بە دڵنیاییەکی تەواو دەکرد و بە ئاواتەوە بووم تاهەتایە ئەو چاخواردنەوەیە کۆتایی نەیەت، (موددی) و ژنەکە لەنێو دەرگاکەدا ڕووەو حەوشە تاریکەکە دەوەستان و پێکەوە دەکەوتنە قسەکردن.

بەڵام هێندەی نەدەبرد ژنەکە بە جێی دەهێشتین و (مووددی)ش دەگەڕایەوە لای جلوبەرگەکان و دەستی بە شتنیان دەکردەوە و هاوکاتیش لەبەر خەریک بوون بەوانەوە لە من دادەبڕا و دوور دەکەوتەوە و دەرگای کراوەش دەگەڕایەوە دۆخی جارانی و دەبووەوە بە کونێکی ڕەشی ترسناک.

کە (مووددی) لە شتنی جلوبەرگەکانمان دەبووەوە، دەبوو بیانبەینە هەورەبانەکەوە و لە ژووری جلوشککردنەوە هەڵیان بخەین. بەڵام لە پێشدا دەبوو هێندە بیانگوشین تا تەواو ئاویان لەبەر دەچۆڕایەوە. لە گوشینی پارچە بچکۆلەکاندا هاریکاریم دەکرد. چەند جارێک هەوڵم دەدا لە گوشینی پارچە قورس و گەورەکانیشدا هاریکاریی بکەم، هەریەکەمان و خۆی لە کونجێکی کوختەکە دەخزاند و من سەری ئەمسەر و ئەو سەری ئەوسەری چەرچەفێکمان دەگرت و بە پێچەوانەی یەکترەوە بامانەدا: کاتێکت دەزانی چەرچەف وەکوو مارێک لەنێوانماندا درێژ دەبووەوە و ئاویش شڵپوهوڕ دەڕژایە سەر ئەرزی کوختەکە.

بە لانی کەمەوە پێنج تا شەش جار بە خۆمان و جلوبەرگی تەڕوبڕ و قورسەوە بە پلیکانە تەنگەبەرەکانی موبەقەکەدا بەرەو هەورەبانەکە سەر دەکەوتین. جلوبەرگەکانمان دەخستە ناو تەشتی گەورەوە و یەکی سەرێکیمان هەڵدەگرت و (مووددی) لە پێشەوە و من بە دوایدا و بێجگە لەوەش ئەو تەشتێکی لەوی یەکەم بچووکتری پڕ لە جلوبەرگی تەڕی دەنایە بن دەستەکەی تری و تەشتە گەورەکەش کە من نەمدەتوانی بە تەواوی بەرزی بکەمەوە، هەندێک جار، بەر دیواری پلیکانەکان دەکەوت. ڕووناکایی سەر پلیکانەکان زوو زوو دەکوژایەوە و منیش زۆر لەوە دەترسام و دەستم بە

دیواری تەنیشت پلیکانەکاندا دەگێڕا بۆ ئەوەی سویچەکە بدۆزمەوە و گڵۆپەکە دابگیرسێنمەوە.

لە سەرەتادا لەسەر پلیکانەی هەر نهۆمێک پشوویەکمان دەدا و لە جارەکانی دواتریشدا لەوەش زیاتر پشوومان وەردەگرت و لەو خانووەدا کە بێدەنگیی شەو باڵی بەسەردا کێشا بوو لەسەر پلیکانەکان دادەنیشتین و لەتاو ماندوویێتی دەکەوتینە هەناسەبڕکێ. تەنانەت تاقەتی ئەوەشمان نەدەما یەکتر بدوێنین. ئارەقە بە دەموچاوی سوورهەڵگەڕاوی (موددی)دا دەهاتە خوارەوە، سەری پەنجەکانی چرچولۆچ بووبوون، وەکوو ئەوەی دوای ئەو هەموو جلشتنە وەکوو دەموچاوێک سەروڕوو بگۆڕن. بێجگە لە چکەچکی سویچی ئۆتۆماتیکیی گڵۆپەکان و دەنگی لێدانی دڵمان، هیچی ترمان بەر گوێ نەدەکەوت.

لە ژووری جلوشکردنەوەکەدا کارەبا نەبوو و لە کاتێکدا کە (موددی) دەبوو جلەکان هەڵبخات، دەبوو من مۆمەکەی بۆ ڕابگرم تا ژوورەکە ڕووناک بێت. مۆمەکە، بە شنەی با و ئەو شێیەی لە جلەکانەوە هەڵدەستا، دەکوژایەوە و دەبوو زوو زوو دایبگرسێنمەوە. لەو کاتانەدا کە یەک لە دوای یەک دەنکەشقارتەم بە قەراغی شقارتەکەدا دەهێنا، خۆم وەکوو ئەو کچە بچکۆلەیە دەهاتە پێش چاو کە لە چیرۆکەکەدا دەنکەشقارتە دوای دەنکەشقارتە دادەگیرسێنێت.

لەنێوان سەعات یەک و دووی شەودا لە جلشتن دەبووینەوە و ئیتر هەردووکمان بە تەواوی شەکەت و ماندوو دەبووین: من ئەوەندە ماندوو دەبووم کە ئیتر تاقەتی ئەوەم نەدەما بیر لە ترس بکەمەوە و بترسێم.

**هیچ جێیەکی تر هەیە** کە تێیدا هێندەی گۆڕەپانێکی چۆڵی قوتابخانە هەست بە تەنیایی و بەجێهێڵراوی بکەیت، ئەمە لە حاڵێکدا کە هاوکاتیش هەست بەوە بکەیت لە لایەن دەسەڵاتێکی بڕیارلەسەرنەدراوەوە هەڕەشەت لێ دەکرێت؟

ئەمە ئەو ئاوازەیە کە لەنێو دەمی هەزاران منداڵانەوە تەوژم دەدات، ئەو ئاوازەیە کە لە پەنجەرە و دەرگا داخراوەکانی بینایەکەوە دەڕژێتە دەرەوە، ئەو ئاوازەیە کە هەورێکی تووڕە بەسەر سەری کەسێکەوە مۆڵ دەبێت و وەکوو برغوویەک لەنێو دڵدا دەگەڕێت، ئاخۆ، لەو ئاوازە زیاتر شتێک هەیە کە هەستی تەنیایی و بە تەنیا بەجێهێڵراویت لا گەورە و گەورەتر بکات!

ئەوە وەکوو ئەو ڕووبارە وایە کە بە هێزە لەبننەهاتووەکەی خۆی تێکوپێکت دەشکێنێت، بەڵام هەرگیز، هەرگیزاوهەرگیز، لەگەڵ هاوبەشییە بە دەنگ و ئاوازەکەی خۆیدا ڕاپێچت ناکات.

ڕاڕەوە درێژ و تەنگەبەرەکانی قوتابخانە پێچەبەدەورە بەنێو پۆلەکاندا درێژ بووبوون، کە لێیانەوە دەریایەک لە دەنگەدەنگ لە هەڵچوون و داچووندا بوو. دەنگی نەرمونیان و نادڵنیای منداڵان و دەنگی بێ چەند و چۆنی گەورەکانم لێوەیانەوە بەر گوێ دەکەوت، لە شووشەی پەنجەرەکانەوە ئەو دەستانەم دەبینی کە بە یەکدا دەهاتن و ڕادەوەشێنران و وەک ئەوە وابوو لە ئاوێکدا بخنکێن، لەو ژوورەشدا کە چاکەت و پاڵتۆکانمان تێدا هەڵدەواسی، جلوبەرگەکانمان لە مرۆڤی بێ سەر دەچوون و لە یەکێک لەو ژوورانەدا (موودی)، لە کاتێکدا خۆی چووە پۆلێکی پڕ لە دەنگ و غەڵبەغەڵبەوە، بە جێی هێشتم.

کاتێک کە دەرگاکەی کردەوە وەک ئەوە بوو کە گشت منداڵەکان پێکەوە دەنگیان لە دەست دابێت، کشوماتی و بێدەنگی هەموو لایەکی گرتەوە و هەر لەو بێدەنگییەشدا دەنگی (موددی)یم بەر گوێ کەوت کە لەگەڵ مامۆستاکەدا قسەی دەکرد و پاشان هەردووکیان هاتنە دەرەوە بۆ ئەو ژوورەی چاکەت و پاڵتۆکانمان تێدا هەڵدەواسی و مامۆستاکەش بە چاکی لێم ورد بووەوە و وتی: دەتوانیت سبەینێ دەست پێ بکەیت و ئەوجا با بزانین بە کەڵکی پۆلەکەی من دێیت یان نا! دوای ئەوەش وتی: هەرچەندە دڵنیا نیم لەوەی بە کەڵک بێیت و ئەوجا بەدەم سەرڕاوەشاندنەوە چووەوە پۆل.

ئەگەر شتێکیش هەبووبێت منیش لێی نادڵنیا و بەگومان بم، هەر ئەوە بوو. هەر بە تەنیا دیمەنی مامۆستاکە زمانی لە گۆ خستم. بالووکەیەکی زل لەسەر لووتی بوو، قژی لوول کردبوو و بۆ سەرەوە هەڵیدابووەوە و کۆمەڵێک دەماری شین و سووری وردیلەش تۆڕێکی تەنکیان بەسەر دەموچاویدا کێشابوو و وای لێ کردبوو کە لە تۆپێکی ڕەنگاوڕەنگ بچێت. لە سنگوبەرۆکییەوە کە وەکوو تەختەیەکی ئوتووکردن ساف بوو، زنجیرێک پێچاوپێچ وەکوو مار تا گیرفانی تەنوورەکەی هاتبووە خوارەوە. پەنجەکانیشی زۆر خێرا و گورجوگۆڵ بوون و هەر زوویش لەگەڵیاندا ئاشنا بووم، ئەو پەنجانەی بە چڵێسییەوە گازیان دەگرت، هێندەی بەرد سارد بوون، ئەو پەنجانەی هەڕەشەی بێدەنگبوون و کپبوونیان پێ دەکرا، ئەو پەنجانەی کاتێک کە نوقوورچیان لە گوێ دەگرت گڕیان تێ بەر دەدا، ئەو پەنجانەی گەلای سێپەڕەی وەکوو پشکۆی داگیرساویان لەسەر گۆنا بە جێ دەهێشت.

له یەکـەم وانەدا بەوە دەسـتـی پێکرد کـە بە منداڵەکـانی ترم بناسـێنێت و بڵـێت کـە لە خـانـەیەکی هـەژاری منداڵانەوە هـاتووم. بە تەواوی جـەخـتـی لەسـەر هـەژاریی خـانـەی منداڵانەکـە کرد و لە منداڵەکـانـی تریشـی پرسـی کـە کـامیـان دەیەوێت لەلامـەوە دابنیـشـێت. بەڵام کـاتێک کـەس ئارەزووی خـۆی پێـشـان نەدا لە تەنیشـتـمەوە دابنیشێت، بردمیـە سـەر کورسـییـەکی ڕیزی دواوە و وتـی: دەتوانیت لێرە دابنیشـیت تا پلەوپایەی نـوێ وەردەگریت و ئەو پلەوپایانـەش هـەر خـۆمـان و بەپێی زیرەکـی دایاندەنێین. پاشـان دەسـتـی بە لێپـرسـینەوەم کـرد و کـەمـیش نەبوون ئـەو پرسـیـارانەی کـە نەمـدەتوانی بە ڕاست و دروسـتـی وەڵامیان بدەمەوە. بە قسـەڕەقییەکەوە وتـی: دیارە پیـاو لە خـانەی منداڵان زۆر شت فـێر نـابێت و ئەوجـا چەند دێڕێکی لەسـەر پارچەکـاغـەزێک نووسـی و خـسـتـیـیـە نـاو زەرفـێکەوە و بە لـێسـتنەوەیەکی درێژ لەمـسـەرەوە بۆ ئەوسـەر زەرفـەکـەی داخـسـت و داوای لێکردم بـۆ مـاڵەوەی بـەرمـەوە. چەند ڕۆژێک دوای ئەوە دەسـتم بە پارچەکاغـەزەکە ڕاگـەیشت و ئەمەم خوێندەوە: جێی هـیچ هیوا و ئومێدێک نییە!

مـامۆسـتـاکەم قـەت نەیتـوانـی دەست لەوە هـەڵگرێت کـە زوو زوو خـانەی منداڵانەکەم بە بیردا بهێنێتەوە و کاتێک لە وانەی جـوگـرافـیـادا دەگـەیشـتـینە سـەر ئەو شـارەی کـە خـانەی منداڵانەکـە لە نـزیکـیـیـەوە بوو دەیوت: دەی کـارلا بـاسـی ئەوەمان بۆ بکە ژیان لە خـانەی منداڵە هـەژارەکاندا چۆن بوو! و ئـیتـر منداڵەکـانیـش ڕوویان بەرەو لای من وەردەگـێـڕا، بەڵام من نەمـدەویست هـیچ شـتـێک بگێڕمـەوە و مـامـۆسـتـاش دەیوت کە من لە ڕوویدا دەوەسـتـمەوە و بۆ ئەوەش چەند دەرەجەیەکی لێ دەشکاندم.

کاتێک کە دەرەجەکانیشمان وەرگرت من لە ڕیزی بیستوپێنج قوتابیدا لە پلەی بیستودوودا بووم. شانازیشم بەوە دەکرد کە سێ قوتابی لە پۆلەکەماندا هەبوون لە من گەلحۆ و دەبەنگتر بوون. (موددی)ش بە پێکەنینەوە وتی: ئەگەر کەسێک لە پلەکەتی پرسی لە پۆلەکەدا، دەڵێین پلەی سێیەمیت لە خوارەوە بۆ سەرەوە.

***لە نانەواخانەکانەوە*** بۆنی نانی گەرم و برژاو بە جادەکەدا بڵاو دەبووە و بۆ لای خــۆی ڕایدەکــێــشــام. هەر کــە دەگەیشتمەوە نێو دەرگاکەش بۆن و بەرامەی شیرین و گەرم شالاویان بۆ دەهێنام: بۆن و بەرامەی ڤانیلا، شۆکولاد، دارچینی و مرەبای تووترک. ئەو نانە تازە و گەرمانەی لەنێو زەرفێکی کاغەزدا لەگەڵ خۆشمدا بۆ ماڵەوەم دەبردەوە، یەکسەر پەڵەی ڕەش و تاریکیان دەخستە سەر زەرفەکە و قەتیش نەمدەتوانی دەست لە خواردنی یەکێک لە نانەکان هەڵگرم، بەر لەوەی بگەمەوە بۆ ماڵەوە.

لە جامخانەی هەندێک لە دوکانەکاندا پارچەپەنیری وا هەبوون کە لە پێچکەی گەورە و خڕ و تۆکمەتۆڵ دەچوون، هەندێکیشیان لە پاکەتی قۆنەرە دەچوون و تا ناوەڕاستیان لە کاغەزی زیوینی بریسکەدارەوە پێچرابوو. پەنیرێکیان وەکوو تۆپی بلیارد خڕ بوو و وەکوو تووریش سوور، بۆ ئەوەش کە پێشان بدرێت لە ناوەوە چەندێ چەور و سپییە، بە چەقۆ درزێک کرابووە بەشە سوورەکەی. کونیان لە پەنیرێکی تریاندا هەڵکۆڵیبوو و بە ناویدا ڕاڕەوەی قووڵ قووڵی دروست کردبوو و هەمیشەش ئارەزووی ئەوەم دەکرد کە هەر پێنج پەنجەم بکەم بەناو کونەکاندا، یان وەکوو ئامێرێکی مۆسیقا دەست بە لێدانی بکەم. بەڵام بە بینینی ئەو پەنیرەیان کە وا دەهاتە بەر چاو کە ئارەقی سەوزی کردبێتەوە، دڵم تێکەڵ و پێکەڵ دەهات.

هەندێ جار دەمبینی چۆن قەسابەکە لاشەی بەرازێکی بە مشارە تیژەکەی لەتوپەت دەکرد. بە هەمان شێوە کە کەمانجەژەنێک دارەکەی بەسەر ژێیەکاندا دەهێنێت و دەبات، ئەویش مشارەکەی بە لاشەی بەرازەکەدا دەهێنا و دەبرد،

کاتێکیش کە دەمی مشارەکە لەنێو گۆشتەکەدا ون دەبوو و دەگەیشتە سەر ئێسقانێک، قریشکەیەکی هێندە تیژ و ناخۆش لە دەمی مشار و ئێسکەکەوە بەرز دەبووە، کە ناچار دەبووم پەنجە لە گوێیەکانم بئاخنم و بە ڕاکردن ئەو ناوە بە جێ بهێڵم.

لە دوکانی پینەچییەکە هەمیشە بوولێڵی ئێوارە بوو. وا پێدەچوو هەمیشە مەترسییەک لە سووچێک لە سووچەکاندا خۆی مەڵاس دابێت و، پێڵاوەکانیش بە هەموو لایەکدا بڵاو بووبوونەوە و لە هەموو لایەک کەوتبوون، وەکوو ئەوەی ئەوانەی لەوێ بە جێیان هێشتبوون، زۆر بە پەلە بووبن بۆ ئەوەی ئەوێ بە جێ بهێڵن. من خۆم تەنیا لە ئاستانەی دەرگاکەدا ڕادەوەستام و پێڵاوەکانم بۆ پینەچییەکە، کە بە چاوی پڕ لە فرتوفێڵەوە سەیری دەکردم، درێژ دەکرد. لەسەر ئەو قۆڵە تووکنەی کە بۆ پێڵاوەکانمی درێژ دەکرد، ژنێکی ڕووتوقووت بە ڕەنگی شین هەڵکۆڵرابوو، تەنیا گۆی مەمکەکانی وەکوو دڵۆپی خوێن سوور بوون.

هەموو جارێک، زرپ و زیندوو، سەربازە لە تەنەکە دروستکراوەکانی (هـ. س. ئەندەشۆنم) لە (ئەمالییەنبۆری) دەبینی، شاریش پڕ پڕ بوو لە ژنەجادووگەر: بە لای کەمەوە هەر ماڵە و یەکێکی تێدا بوو. لەو ماڵەدا کە من تێیدا دەژیام، جادووگەرێک هەبوو کە ئێسکی لووتی شکا بوو و زۆرجار تووڕەم دەکرد و ئەویش بە منگەمنگ و جوێن وەڵامی دەدامەوە: پاشان لەوە تێگەیشتم کە جادووگەرە ڕاستەقینەکە خۆم بووم و ئەو نەبوو.

لەبەر ئەو جامخانانەدا کە پڕ کرابوون لە یاریی منداڵان، تەنیا هەر ئەوەندەم بۆ دەکرا بێدەنگ و بە دەمی داپچڕاوەوە

ڕابوەستم: چەندێ جوانن! بە دڵنیاییەوە هەر لە بەردەمی یەکێک لەو جامخانانەدا بوو کە دزێکی بچکۆلە لە ناخمدا لە دایک بوو!

لە یەکێک لەو جامخانانەدا بەردێکی هیوا و بەختی لە شووشە دانرابوو: هەموو ڕەنگەکانی پەلکەزێڕینەی تێدا دەبریسکایەوە. من دەبێت ببم بە خاوەنی ئەو بەردە! نرخی بەردەکە یەک (کرۆن) بوو و منیش تەنیا بیستوپێنج (ئۆرە)م پێ بوو. سێ ئێوارە لەسەر یەک لە جزدانەکەی (موددی) بیستوپێنج (ئۆرە)ییم دزی. بەو جۆرە ئەو بەردەم کڕی: بەڵام هەر ئەوەندەی کەوتە دەستمەوە، هیچ خۆشی و شادییەکم تێدا نەما.

تەنیا بیرم لەوە دەکردەوە کە ئیتر بۆ لەمەودوا لە دزێک زیاتر نیم.

***ئەوەتا خۆت دەیبینیت***، منداڵێکی نائاساییە. تۆ سەیری چاوە ڕەش و تووڕەکانی بکە، نابینیت هەمان چاوی ڕەش و تووڕەی مێردەکەتی هەیە؟ من هەمیشە ئاگادارم کردویتەوە و وتومە، هەڵگرتنەوەی منداڵی خەڵکی تر بێ سوودە! دایکی (موددی)، کە ئەوەندە خواپێداو و خانومان بوو کە بۆم نەبوو بە نەنە بانگی بکەم و هەر ئەوەندەم ڕێ پێ دەدرا بانگی بکەم (مادسن) خان، بەو شێوەیە قسەی دەکرد. نەشمدەتوانی لەسەر ئەوە لێی ببوورم کە پێی وا بوو چاوم لە چاوی (ی. پ. یێنسن) دەچن.

کردبوومان بە خوو، کە لە سەردانی (مادسن) خان دەگەڕاینەوە، لاڕێیەکمان دەگرتە بەر بەناو کارگەیەکدا تێدەپەڕی، بەڵام لەسەر دەروازەکەی تابلۆیەک هەڵواسرابوو و لێی نووسرابوو: *ئاگاداری ئەو سەگە بە، کە ئێواران لەم ناوەدا بەرەڵا کراوە!* زۆربەی جارانیش ئێواران دەگەڕاینەوە. بە ترس و لەرزەوە بە (موددی)م دەوت: ئاخر خۆ سەگەکە نازانێت کە ئێمە مۆڵەتمان دراوە بەم ڕێگایەدا بڕۆین. ئەویش پێدەکەنی و دەیوت: ئەگەر وەکوو مشک بێ دەنگ بڕۆین، بێ گومان، گوێی لێمان نابێت. ئێمەش وەکوو مشک، بێ دەنگ، ڕێمان دەکرد و دڵیشمان وەکوو تەپڵ لێی دەدا و ئەو جێیەی سەگەکەشی تێدا بوو دەکەوتە دەستەچەپمانەوە و هەموو لای چەپیشمان لە حەژمەتاندا دەئێشا و کاتێکیش کە بە تەواوی دوور دەکەوتینەوە، (موددی) دەیوت: ئەمجارەش پارچەگۆشتێکی خۆشی لە کیس خۆی دا.

کە سەگە بچکۆلەکەی (مادسۆن) خانی خانومانیش، لە کاتی پشوودا، لای ئێمە بە جێ دەهێڵرا، دەبوو من ئاگاداری بم و لەگەڵیدا بچمە دەرەوە و کە دەشمویست یاریی لەگەڵدا

بکەم، (گـودروون) پێی دەوتم: خـۆ تۆ بە ناخـێـرێ لە سـەگ دەترسـیت! ڕاسـتـیـشـی دەکـرد، ئای کـە ڕاسـتی دەکـرد، و دەیوت: بیـدەرە دەسـتـم و منیش پەتەکـەم بـۆ درێژ دەکـرد و (گـودروون) و سـەگـەکـە پێکەوە بە ڕێگاکـەدا پێـچـاوپێچ بەرەوخـوار دەبوونەوە و ئەو پێدەکەنـی و خۆشـی و وەڕەوەڕی سـەگـەکـەش ڕێگاکـەی پڕ دەکـرد و منیش لەنێـو دەروازەکـەدا دەوەسـتـام و لە لەشـگرانـی و تەنیـایی زیاتر هەسـتم بە هیـچی تر نەدەکرد.

کە جلوبەرگی کەشـافەشـم پۆشـی، لێیـان کـردم بە هـەڵا و هـاواریـان کـرد: پشـکنەر، تـۆ پانتـۆڵی کـچـانەت لەبـەردایە! خـواسـتی مـن نەبـوو، خـەتای (ی. پ. یێنسن) بـوو کـە کـردمی بە کـەشـافـە. خـواسـتی من نەبوو، خـواسـتـی (ی. پ. یێنسن) بوو کە دەبوو پێڵاوی خلیسکێنە لە پێ بکەم و بەسـەر مـەیدانی خلیـسـکێنـەی پاشـایانـەدا بە خلێـسکێنەوە خـەریک بم. تەنیـا منداڵی مـاڵە گـەورە و خـواپێـداوان بوون، کـە دەبـوون بە کـەشـافـە و لەو مـەیدانەشـدا خـۆیان بە یاریی خلیـسکێنەوە خـەریک دەکـرد. بەڵام (ی. پ. یێنسن) بەوپـەڕی دڵئـاواییـەوە خەرجیی ئەو شتانەی دەدا و دەیویست لە ڕێگای منەوە خۆی بۆ ئـاسـتی ئـەوان بەرز بکاتەوە، بـەڵام ئەو شـتـانە منیـان هێندەی تر بەرەو نزمی کێش دەکرد. کچەکانیش دەیانپرسی: ڕاسـتـە دەڵێن کـە تۆ لە هەورەبانێکدا دەژیت؟ ڕاسـتـە دەڵێن باوکت مـەیگێڕە؟ ڕاسـتـە دەڵێن تۆ لـە خـانەی منداڵان بوویت؟ ئەی بـە ڕاست دارای ئەوەیت بتـوانیت لەگـەڵمـان بێـیت بۆ خـێوەتگای کـەشـافـەکان؟ بە سـەرڕاوەشـاندنەوە کـە ئەوانە گشـتیـان ڕاسـتن، وەڵامـی پرسیـارەکانم دەدایەوە، بەڵام کـاتێک کـە (ی. پ. یێنسن) لە مـاڵەوە نەدەبوو هەمـوو کـچـە هەژار و

دەستکورتەکانم لە خۆم کۆ دەکردەوە و بۆماڵەوە بانگهێشتنم دەکردن و کەیفیشم لەوە دەهات کە (موددی) بیبینم چۆن خواردنیان لەبەر دەستدا دادەنێت و چۆن ئەوانیش بەوپەڕی برسێتییەوە هەڵدەکوتنە سەری.

***(ی. پ. یێنسن)*** زۆر تووڕەوتڕۆ دیار بوو و وتی: دەی ئیتر ئێستاکە کە بوویت بە کەشافە، دەشبێت بوێریت بە تەنیا بچیت و خەڵووزمان بۆ بهێنیت؟

منیش بەدەم پاڕانەوەوە سەیری (موددی)م کرد و لەبەر خۆمەوە وتم: هێشتا نەبووم بە کەشافەی تەواو و لە نەوجەوانیش زیاتر نیم.

بەڵام (موددی) نەیوێرا قسەی (ی. پ. یێنسن) ڕەد بکاتەوە، بەڵکو سەتڵی خەڵووزەکەی بۆ درێژ کردم و بەدەم داوای لێبووردنەوە وتی: خۆشت دەزانیت کە هیچ شتێک نییە لێی بترسیت! بەڵام ڕێک ئەوە بوو کە شت هەبوو لێی بترسم: ئاخۆ (موددی) پشیلەکانی لە بیر کردبوو؟

سەتڵەکەم بە دەستەوە گرت و بەدەم دڵەکوتێوە بە هێواشی بەسەر پێنج پلەی پلیکانەی موبەقەدا چوومە خوارەوە. پشیلەکان کردبوویان بە خوو و لەسەر دواپلیکانە کۆ دەبوونەوە و لەو کاتەشدا کە من گەیشتمە خوارەوە لەوێ بوون و لەسەر قەراغی پەنجەرەکەی تەنیشت دانیشتبوون و سەیری حەوشەکەی پشتماڵیان دەکرد، بەڵام هەر کە دەنگی پێی منیان بیست، بە پەلە، ئاوڕیان دایەوە و چاوە جادووییە بەئاگاکانیان تێ بڕیم.

یەکسەر سەتڵەکەم لەلاوە دانا و هەموو لەشم کەوتە لەرزین. نە وێرام بەرەو ژێرخانەکە بەردەوام بم و نە بە پلیکانەکانیشدا بەرەودوا بگەڕێمەوە. ترسم لێ نیشتبوو و بۆ ماوەیەک بە دوودڵییەوە لە جێی خۆم ڕاوەستام، ڕەنگ بوو ئەگەر خۆم بجووڵاندایە، پشیلەکان هەڵمەتیان بۆ بهێنامایە.

کاتێکیش کە خۆم گورج کردەوە و، دەستم دایەوە سەتڵەکە و لە قەراغی پەنجەرەکە نزیک بوومەوە، پشیلەکان، یەکسەر،

بازیان دایە خوارەوە و تەنیا، یەک، دوو، سێ، چوار... دەنگی پێیەکانیانم هاتە بەر گوێ و هیچی تر و هەمووشیان پێکەوە پێش من بە ڕاکردن خۆیان بە ژێرخانەکەدا کرد و لە تاریکییەکەیدا ون بوون ـ

چرام نەبوو و دەبوو بەرەو ژێرخانەکەی خۆمان دەست بگێڕم و بیدۆزمەوە. ئەوەندە بە وردی چاوم لە تاریکییەکە بڕیبوو و چاوەکانم ژانیان کردبوو و هەموو وەختەکەش بیرم هەر لای پشیلەکان بوو و لە خۆم دەپرسی بۆ کوێ چوون. ڕێک لەو کاتەدا هەستم بە شتێکی نەرم کرد بە قاچمدا هەڵگەڕا و دەستم بە لووشکەلووشک کرد، بەڵام ترساو بە لووشکەلووشکەی خۆم یەکسەر خۆم کۆ کردەوە. لە دەستەڕاستمەوە چەند چاوێک دەدرەوشانەوە و نەختێکیش لەوان دوورتر چەند چاوێکی تر خۆیان مەڵاس دابوو، بەڵام بەخت یارم بوو و پێویستم نەبوو بەرەو ئەوێ بڕۆم و گەیشتبوومە بەردەمی دەرگاکەی خۆمان و هەر چۆنێک بوو کلیلەکەم کرد بە قفڵەکەدا.

ڕێک لەو کاتەدا کە دەرگاکەم کردەوە، پێش من، پشیلەیەک خۆی کرد بە ژێرزەمینەکەدا. لەسەر خەڵوزەکە دانیشت و چاوەکانیشی بە ڕوومدا دەدرەوشانەوە و پاسی هەر جووڵەیەکیان دەکرد کە دەمکرد.

بە کاوەخۆ خۆم بۆ خاکەنازەکە چەماندەوە و بە وریاییەوە، بۆ ئەوەی زۆر لە پشیلەکە نزیک نەکەومەوە، لە بەشی هەرە سەرەوەی خەڵووزەکەم گیر کرد. بەڵام ـ دەنگی خاکەنازەکە کە لە ئەرزە ڕەقەکە دەخشا، منیش و پشیلەکەشی ترساند. مشەیەکی کرد و بە بازێک خۆی لەسەر خەڵووزەکەوە هەڵدایە خوارەوە و خۆی کرد بە ڕاڕەوی ژێرخانەکەدا.

منیش ــ کە هەستم بە نزیکبوونەوەی مەترسییەکی تر دەکرد ــ بە ترس و لەرزەوە خاکەنازەکەم بەردا و دەستم دایە سەتڵە نیوە پڕەکە و بەبێ ئەوەی دەرگاکە دابخەمەوە بە ڕاکردن چوومە دەرەوە، بە هەناسەبڕکێ بە پلیکانەکاندا خۆم گەیاندەوە بەر دەرگاکەمان و دڵیشم تەپەتەپ لێی دەدا و لێی دەدا.

بێ هیچ لۆمە و سەرزەنشتێک (موددی) سەتڵە نیوەپڕەکەی لە دەست وەرگرتم و لە بەختی منیش (ی. پ. یێنسن) لە ماڵەوە نەبوو و ڕۆیشتبووە دەرەوە.

***ویستم و نەمویست***: لە ڕاستیشدا لە دڵەوە ویستم بەڵام، سەرباری ئەوەش نەمویست لەگەڵ ئەو گەشتە هاوبەشانەدا بم کە کەشافەکان پێکەوە دەیانکرد، چونکە هەستم دەکرد کە کچەکان ڕقیان لێم دەبێتەوە لەسەر ئەوەی جارێک لە جاران منداڵی خانەی مندالان بووم و ئێستاش لە هەورەبانێکی هەژاردا دەژیام و باوکێکیشم هەبوو مەیگێڕ بوو ــ

هێشتا نەبووبووم بە کەشافەیەکی کارامە و تەواو، بەڵکو تەنیا نەوجەوانێک بووم و بەس. فێر بووبووم بە شێوەیەکی تایبەت گرێ لە پەتەکەم بدەم، گۆرەوەی بچنم و بدورمەوە، ئەوەش فێر بووبووم چۆن بەیانیان و ئێواران سڵاو لە ئاڵا بکەم و بێجگە لەوەش گشت ئەو پەیمانانەم لە بەر بوو و دەمتوانی بیانلێمەوە کە کەشافەکان دابوویان: ئەو پەیمانانەی کە تێگەیشتبووم لەوەی کە قەت ناتوانم بیانبەمە سەر.

کەشافە هەمیشە یارمەتیی خەڵک دەدا: بەڵام بە کاری چی دەهات یارمەتیی خەڵک بدەیت، لە کاتێکدا کە تۆ خۆت لێدەدرایت و شەرم و شکۆیان دەشکاندیت؟ بۆ نموونە کە هەوڵم دەدا یارمەتیی (موددی) بدەم کاتێک (ی. پ. یێنسن) دەیویست ئازاری بدات و من بەر لێدان دەکەوتم، یان کاتێک کە دەمویست یارمەتیی ژنێک بدەم و لە شەقام بیپەڕێنمەوە و ئەویش بەدەم گاڵتەپێکردنەوە پێدەکەنی و دەیوت: ئەم منداڵە چڵمنە، خۆی بە چی دەزانێت؟ و ئەوجا ئەو، بە نازوفیزەوە، بە شەقامەکەدا دەپەڕییەوە، لە کاتێکدا کە من بە تەنیا و لەگەڵ ئەو یارمەتییەدا، کە بە کاری هیچ شتێک نەدەهات، لە جێیەکەی خۆمدا دەمامەوە.

نەمدەزانی وشەکانی وەکوو گوێڕایەڵیی فەرمان و خۆشەویستیی مرۆڤ، لە ڕاستیدا، چ مانایەکیان هەیە بەڵام،

مانای ئازایەتیم بە چاکی دەزانی و دەشمزانی نە قەت ئازا بووم و نە قەتیش ئازا دەبم. هەمیشە ڕاستگۆییش، بە کەڵکی هیچ نەدەهات! زۆرجاران کە ڕاستییەکەیم وتووە یان بەر شەپازللە دراوم یان بە سەرزەنشتەوە سەیر کراوم. نەخێر، هەرگیز نەدەکرا و نەدەبوو ببمە کەشافەیەکی چاک و تێیدا سەرکەوتن بە دەست بهێنم!

بەڵام ئەو ڕۆژە ئیتر کاتی گەشتەکەمان بوو بۆ (سۆریۆ). دەچووین بۆ سەیرکردن و لێوردبوونەوەی کڵێسا بەناوبانگەکەی و پاشانیش دەچووین بۆ مەلەکردن لە دەریاچەکەیدا.

نەمدەویست لەگەڵیان بچم، حەزم لە چوونە ناو و مانەوە لەناو کلێسا نەدەکرد و بێجگە لەوەش هێشتا فێری مەلەکردن نەبووبووم و لە گاڵتە و لۆمەی کچەکانی تریش دەترسام، بەڵام (ی. پ. یێنسن) پێی لێ داگرت و وتی: پیاو کەشافە بوو، ئیتر کەشافەیە و ناچاریشە ملکەچی فەرمان بێت!

بە سەروسەکوتێکی گرژ و مۆنەوە جلی کەشافەم لە بەر کرد، بلووزێکی درێژی گەورە و تەنوورەیەکی شینی تۆخ! ئێمەی نەوجەوان، پێش ئەوەی بەڵێنی کەشافەیی بدەین، بۆمان نەبوو ئەو پشتێنەی کە بە لایەکیدا خەنجەرێک هاتبووە خوارەوە ببەستین و، منیش لە هەموو کەلوپەلەکانی تر زیاتر حەزم لەو پشتێنە دەکرد.

(موددی) کڵاوێکی بچکۆلەی لە سەرم نا و قژە کاڵ و بێرەنگەکەمی تێدا شاردەوە و وتی: کوا بتبینم، ئێستا هەر زۆر کەشخە و جوان دیاریت! ئەوجا کۆڵەپشتەکەمی هێنایە پێشەوە و تێشووەکەم، جلی مەلەکردن، کتێبی گۆرانیی کەشافان و قەڵەمبڕێکی تێئاخنی. هەمیشە شەرمم لە

کۆڵەپشتەکەم دەکرد، لە کاتێکدا کە کۆڵەپشتی کچەکانی تر هێندە سیخناخ بوو کە جێی شتی تریان تێدا نەدەبووە، ئەوەی من نیوەپڕ و شلومل بە شانوملمدا دەهاتە خوارەوە.

بە قیتار چووین بۆ (سۆریۆ). لە وێستگەکەی ئەوێوە دڵشاد و بەدەم وردەقسەوە بەرەو کڵێسا سەرەکییەکەی ڕۆیشتین. لە دەرەوە هەوا خۆش و گەرم بوو، بەڵام لەناو کڵێساکەدا زۆر سارد بوو و بۆمانیش نەبوو وشەیەکمان لە دەم بێتە دەرەوە و سەیرکردنی گومبەزی سەر کڵێساکەش گێژ و وڕی کردم و لە بەرانبەر ئەو تابلۆیانەشدا کە بە ڕەنگە تاریک تاریکەکانیانەوە هەڕەشەیان دەکرد، هەستم بە نیگەرانی دەکرد و بیریشم لەوە کردەوە کە مەحاڵە مەسیحم خۆش بووێت کە بە خاچەکەیدا دەستی بۆ هەردوو لا درێژ کرابوو و هەڵواسرا بوو، هەروەها خوێن بە دەموچاوی، لەپی دەست و تەختی پێ بزمارڕێژکراوەکانیدا هاتبووە خوارەوە و هەروەها نەمدەویست ئەویش خۆشی بووێم، بیرم لەوە دەکردەوە و هاوکاتیش لەو بیرکردنەوەیەم دەترسام و بە تاسە و ئارەزووی ئەوەوە بووم بە زووترین کات لە کڵێساکە بچینە دەرەوە و خۆمان بدەینە بەر تیشکی هەتاوی ئەو هاوینە.

هەر کە لە کڵێساکە هاتینە دەرەوە، هەموو پەلەپەلمان پێ کەوت بۆ ئەوەی بە زوویی خۆمان بگەیەنینە دەریاچەکە. بە خێرایی خۆمان ڕووت کردەوە: کەشافە قەت نابێت دوودڵ بێت. ئەوانەی دەیانتوانی مەلە بکەن، گورجوگۆڵانە لەناو ئاوی بە سەوزایی تەڵخبووی دەریاچەکەدا کەوتنە مەلەکردن و ئەوانەش کە تازە فێری مەلە بووبوون، هەرجارە و دوو سێ کەڕەت بە مەلەکردن خۆیان بە ئاوەکەدا دەکرد و ئەوجا نەختێک لەناو دەریاچەکەدا دەوەستان تا گوڕ بدەنەوە بەر

خـۆیـان و خـۆیان لە ئـاوەکـە هەڵبکێـشنەوە، بەڵام مـن، کـە نەمــدەتوانـی مــەلە بـکەم، لە تـەنکاییـەکــەوە بەرەو قــووڵایی ڕۆیشتم و نادڵنیا بووم و هەستم بە قـوورولیتەی دەریاچەکەش کرد.

ئەوەندە ڕۆیشتم تا ئاو گـەیشـتـە بنبـاڵم و منیش وەکـوو داوەڵێک کـە بـە ڕێوە بێت قـۆڵەکـانم بەسـەر ئاوەکـەدا درێژ کردبووەوە. ئەوانەی مـەلەیان دەکرد، دەیانقیژاند و پێدەکەنین و ئاویان بە یەکتـردا دەپرژاند و ئەوانەش کە تازە فێری مـەلە بووبوون گورجوگۆڵتر بووبوون و هەرجارە و زیاتر لە ئاوەکەدا دەمانەوە و مەلەیان دەکرد و لە کەیف و خۆشیدا بەدەم بوێری و نەترسیی خـۆیانەوە پێدەکەنین، بوێری و کـەیف و خـۆشـیی ئەوان بە ئاوەکـە، منیـشـی گـرتەوە و بە خـۆشی و شـادییـەوە دەستم بە هەڵبەز و دابەز کرد، خۆم لە ئاوەکەدا نقووم دەکرد، دەهـاتمە دەرەوە و دەهـاتمە دەرەوە و خۆم نوقووم دەکرد و...

بەڵام لە پڕێکدا هەستـم کـرد کـە تا دێت پێـیـەکـانم لە بنی ئاوەکە دوور دەکـەونەوە و لەگـەڵ هـەر بازێکی تازەدا زیاتر بە قـووڵاییدا ڕۆ دەچم و تا دەهات زیاتریش لە ئـاوەکەدا نقـووم دەبووم و پاش هەرجارێکیش وام هەست دەکرد کە قوورولیتەی بنی دەریاچەکـە زیاتـر پێـیـەکـانم هـەڵدەمـژێت و زیـاتر بەرەو قووڵایی ڕاپێچم دەکات، تا ئاخرییەکەی وام لێ هات کە چیتر نەوێرم هەڵبـەز و دابەز بکەم. ئاوەکـە تا ملـم هـاتبـوو و، کـە هەوڵیـشـم دا خـۆم بۆ سـەر ئاوەکـە درێژ بکەم و هـاوار بـکەم زیاتر بەناو ئاوەکەدا ڕۆچووم و ئیتر ئەوکاتە ئاو گەیشتبووە دەمم و سـەرم کـەوتبـووە بن ئاو و نـەمـدەتوانـی هەناسـە بدەم و چاوەکانم ڕەش داگەڕان و وا پێدەچوو کە ئیتر پێیەکانم لە بنی دەریاچەکـە دابڕاون و بەڵام هەر ڕێک لەو کـاتەدا یـەکـێک پڕی

کرد بە پرچەکانمدا و بۆ سەر ئاوەکە بەرزی کردمەوە و بەرەو کەنارەکە ڕایکێشام و بە تەنیایی لەوێدا بە جێی هێشتم.
قوڕولیتە لە دەموپلم هاتە دەرەوە و بەدەم ئاهەهەڵکێشان و لووشکەلووشکەوە نەمتوانی لەوە تێ بگەم کە چۆنە کچەکانی تر لەســـەر یاری و گـــەمـــەی خـــۆیان بەردەوامن، لەناو دەریاچەکەدا پێدەکەنن و ئاو بە یەکتردا دەپرژێنن: کتومت وەکوو ئەوەی هیچ ڕووی نەدابێت!
کە بۆ ماڵ گەڕامەوە باسی ئەوەم بۆ (موددی) گێڕایەوە کە چی ڕوویداوە و ئەویش بە (ی. پ. یێنسن)ی وت: دووربا دووربا، بەڵکو منداڵەکەمان بخنکایە و بە جێی بهێشتیانە! (ی. پ. یێنسن)یش وتی: هیچ نییە، هەر خـۆی دەنوێنت! یەکشەممەش بوو، بۆیە وتی: بە هەر حاڵ من دەڕۆمە دەرەوە بۆ پیاسەکردن! ئەوجا هەڵسا و بە جێی هێشتین. من و (موددی)یش دەمانزانی کـە پیاسـەکردنەکـەی ڕێک بەرەو نزیکترین مەیخانەی دەبات، تا نەبوو بە سێی شەویش نەهاتەوە و کە هاتیشەوە بەتەواوی سەرخۆش بوو.

***(ی. پ. یێنسن)*** مەیگێڕ بوو. مەیگێڕ لە دەرەوە و سەردار و سەرەوەری ماڵەوە. (ی. پ. یێنسن) بە ڕێزەوە لە شووشەبیرەکەی دەستی دەڕوانی. سەرەتا، پێش ئەوەی بیگەیەنێتە دەمی، بە لەخۆباییبوونەوە، کەوانەیی بەرزی دەکردەوە و ئەوجا قوڕگی پڕ دەکرد لەو شلەمەنییە زەردە ئاڵتوونییە خەواڵووە. (ی. پ. یێنسن) زۆربەی کات سەرخۆش بوو. مگێزی ئەو لەنێوان هەستناسکییەکی تەڕوبڕ و زاڵمییەکی بێ سەروبەردا لە هاتن و چووندا بوو. هەندێ جار، کاتێک کە هەستت بەوە دەکرد کە چەند چاک و دڵنەرمە، چاوەکانی پڕ دەبوون لە فرمێسک و هەندێک جاریش چاوەکانی وەکوو دوو کوڵەوەیبابی ڕەش وا بوون. (ی. پ. یێنسن) تاقمی ددانی لە دەمدا بوو کە جارجارە وەکوو بۆقی سپی لەناو دەمیدا هەڵدەبەزینەوە. (ی. پ. یێنسن) سمێڵێکی سووری زەردباوی هەبوو کە قەت فریا نەدەکەوت وشک بێتەوە و دەشیویست نەک پێڵاوەکانی، بەڵکو چالایی بنی پێلاوەکانیشی بۆ بۆیاخ بکرێت و بە شەوق و ڕەونەق بن.

(ی. پ. یێنسن) بە دڵخۆشییەوە، بەبێ ئەوەی من بمەوێت، بەرزی دەکردمەوە و دەیخستمە سەر جۆلانە و هەر خۆشی بوو کەیفی بەو کارەی دەهات. زۆر حەزی دەکرد، بەبێ ئەوەی پرس بە دەستەکانم بکات، دەستم بگرێت. حەزی دەکرد هەمیشە درەنگ بەدەم خەڵکەوە بچێت بۆ ئەوەی سەرنجیان بۆ لای خۆی ڕابکێشێت و کاتێک کە خۆشی میوان بوو هەمیشە بە گژ مەیگێڕەکانی تردا دەچووەوە. ئەگەر (کرۆن)ێکی ببەخشییایە، دەیویست، هێندەی ئەوەی کە سەد (کرۆن)ییەک ببەخشیت، سوپاسی بکرێت.

(ی. پ. یێنسن) زۆر شانازی بە ناوەکەی خۆیەوە دەکرد.

کـاتێک کـە زۆر تووڕە دەبوو، پەلـی (مـوددی) ڕادەکـێـشـا و دەیبردە ئەودیوی دەرگاکەوە و دەسـتـی بۆ تابلۆی سەر دەرگاکە درێژ دەکـرد و دەیـوت: ئەوەتا دەیبـیـنیت کـە لەسـەر دەرگـاکـە نووسـراوە (ی. پ. یێنسن) و ئەوەش بـەو مـانـایە کـە منم لێـرە دەژیم و هـەر منیشم کە فەرمان دەدەم و کەسـی تر نا.

ڕۆژێکیان (ی. پ. یێنسن) هـاتەوە بۆ ماڵەوە، ڕۆژنامـەیەکی فڕێدایە سـەر مـێـزەکە و بـە لەخـۆبایـبوونێکەوە وتـی: منتـان لە ڕۆژنامەدا بینیوە؟ خوێندمـانەوە: (ی. پ. یێنسن)ی مەیگێڕ لە لایەن دادگـــاوە بە سـی (کـــرۆن) ســــزا دراوە، چـونکـە خواردنەوەی داوە بە کەسێکی زۆر زۆر سـەرخۆش.

(ی. پ. یێنسن) ئـەو بەشـــەی لـە ڕۆژنامــەکــە دادڕی و لە جزدانەکەیدا شـاردییەوە.

کە (ی. پ. یێنسن) بە زۆری بـێ کەیف و تاڵ و تـاریک بوو، زۆربەی کـات (مـوددی) ڕووخـۆش و دڵشـاد بوو. وا پێـدەچوو هـەمـیـشـە لـە جـمـوجـووڵدا بێت. بـە ئاسـتـەمـیش بە بیـرمـدا نایەتـەوە کـە (مـوددی)یم بینـیـبـێت بـە هـێـمنی و بۆ پشـوودان لەسـەر کـورسـییـەک دانیـشـتـبێت: یان هـەر کـەمێک لەوەوبەر لەسـەر کـورسـییـەکە پـاڵی دابووەوە و لەشـی بەو پـاڵدانەوەیە گـرژ بووبوو و وا دەهـاتە پێش چاو کـە ئێسـتا نـا نەختێکی تر لەسـەر کورسییەکە هەڵدەستێت و دەکەوێتـەوە جموجووڵ، یان لەوەدابوو کـە بەڕێوەیە بێت لەسـەر کـورسـییەکە هـەڵبسـێت و بەرەو دەرەوە بکەوێتە ڕێ.

(موددی) بەدەم یاریکردن و دڵخـۆشییەوە ماڵەکـەمانی پاک دەکـردەوە: کاتێک کـە پارچەپەڕۆکەی دەگرت بە دەسـتیـەوە بۆ ئەوەی تـەپوتـۆزی مـــاڵەکـــە پاک بکـاتەوە وەکـــوو ئـەوە وابوو جـۆرێک لە سـەمـای بالێت بکات! گـاهـ لەسـەر پەنجە دەوەسـتـا

تا تەپوتۆزی سەر دۆلابەکە بماڵێت و گاھ بە تەواوی خۆی دەچەماندەوە بۆ ئەوەی پێچکەی کورسییەک پاک بکاتەوە، جاروبار دەکەوتە سەر پەل بۆ ئەوەی دەستی بگاتە تەپوتۆزی ژێر قەنەفەیەک یان نیوەی لەشی لە پەنجەرەیەکەوە دەردەهێنا و دەکەوتە تەکاندنی ئەو پەڕوپاتاڵەی دەستی کە تەپوتۆزی ماڵەکەی پێ ڕادەماڵی: جاروباریش بەدەم تەماشاکردنی شتێکی خۆشەوە کە لە جادەکەدا بەدی دەکرد لە پەنجەرەکەدا دەمایەوە و هاواری لە منیش دەکرد کە بچم و تەماشا بکەم.

بۆ ئەوەی دەستی بە تەونی جاڵجاڵۆکەی بنمیچەکەشدا ڕابگات دەچووە سەر پێتەتەیەکی بچکۆلە و خۆی بۆ درێژ دەکرد: لەوێدا وەکوو سەماکەرێک لەسەر یەک قاچ بەملا و ئەولادا دەهات و بە هەموو لایەکدا دەستوپلی بەرەو تەونەکە ڕادەوەشاند و تا لە ئەنجامدا بەدەم ئاوازی سەرکەوتنەوە هاواری دەکرد: ئەوە تەونەکەشم ڕاماڵی.

هەر کە تەپوتۆزی سەر پیانۆکەشی ڕادەماڵی، بەوە کۆتایی پێ دەهێنا کە لەمسەر تا ئەوسەر دەست بەسەر دانەکانیدا دەهێنا و لەگەڵیشدا گۆرانی دەوتەوە.

کە ئەرزەکەی دەشت، هێندە ئاوی بەسەردا دەکرد کە دەمانتوانی خۆمان لە ئاوەکەدا ببینین و زۆربەی کاتیش لەگەڵ گوشینی پەڕۆکەی دەستیدا پێڕادەگەیشت شتێکی خۆش بگێڕێتەوە. (موددی) لە دڵەوە قسەی بۆ کەلوپەلەکانی نێومالّ دەکرد: دەیتوانی بە کورسییەکی کۆن بڵێت: بێگومان دەبینم کە کۆن بوویت، بەڵام هیچ ترست نەبێت، هێشتا کاتی ئەوە نەهاتووە فڕێت بدەمە سەر سەرەنوێلکەکە، لەجیاتی ئەوە قوماشێکی تازەت بۆ دەکڕم! یان دەیتوانی بەرەو لای سەعاتە چاڵمە زلەکەمان بڕوات و بەدەم پەنجەدان لە پاندۆلەکەیەوە

بڵێت: گوێ بگرە، ئەمڕۆ دەبێت بە زۆر شتدا ڕابگەم و بۆیە نابێت وەکوو ئەوەی کردووتە بە خوو ئەمڕۆش پەلەم لێ بکەیت! ناتوانێت نەختێک هێواشتر بیت؟ یان بۆ ئەوەی کوپی قاوەیەک کە تازە دەسکەکەی شکابوو هێور بکاتەوە دەیوت: ئەوەندە خۆت سەغڵەت مەکە، باشتر کە ئیتر گوێت لە قسەوقسەڵۆکی کوپەکانی تر نابێت، و بێجگە لەوەش لە پلەوپایەت بەرز دەکەمەوە و دەتکەم بە شەکردان! ئەوجا (موددی) کوپە بێ دەسکەکەی پڕ دەکرد لە شەکری سپی کە لەناویدا دەدروشایەوە.

ئەگەر لە خۆڕاش پەستی و دڵتەنگ بوومایە، (موددی) کاغەزی یاریکردنەکەی دەهێنایە پێشەوە و دەیوت: وەرە با دەستت بۆ بگرمەوە! هیچ سنوورێک بۆ ئەو شتە خۆش و قەشەنگانە نەبوو کە گفتی دەدا لە پاشەڕۆژدا پێیان بگەم! دوای ئەوەش قاوەمان دەخواردەوە.

(موددی) زۆرجاران پێ دەوتم: کە پیاو دڵتەنگ و پەست بوو دەبێت قاوە بخواتەوە و کە دڵشاد و دڵخۆشیش بوو هۆکاری زیاتری بە دەستەوەیە بۆ قاوەخواردنەوە. ئای چەند جار پێکەوە بەدەم قاوەخواردنەوەوە خۆمان لە خەم و پەژارە ڕزگار کرد و چەند جاریش هەر بەدەم قاوەخواردنەوە زیاتر و زیاتر بەناو خۆشی و دڵشادیدا ڕۆچووین.

***هەر سێ هەفتە جارێک***، یەکشەممان، (ی. پ. یێنسن) دەستبەتاڵ دەبوو و هاوینان هەمیشە دەبوو بە سەیران و گەشتێک ئەو ڕۆژەمان پیرۆز بکردایە و هەمیشەش دەچووین بۆ (دیورەهاڤسباکێن).

من ڕقم لەم گەشت و سەیرانەی یەکشەممان دەبووەوە کە هەمیشە بە ناخۆشی دەبڕایەوە، بەڵام لەوە دەچوو (موددی) نەیەوێت ئەو هیوایە لە دەست بدات کە هەر نەبێت جارێک لە جاران سەیرانێکی سەرکەوتوو بە سەر بەرێت و هەموو جارێک بە هەمان چاوەڕوانی و پەرۆشەوە تێشووی دەپێچایەوە و کەرەسەکانی ئامادە دەکرد.

بەیانیی یەکشەممەیەک لەو یەکشەممانە وەکوو هەرجارێک سەعات یانزە دەستمان پێکرد و سەبەتەیەکی گەورەی پڕ لە خواردەمەنی و تۆپێکمان لەگەڵ خۆماندا برد. تۆپەکە بۆ ئەوەی من یاری پێ بکەم. ــ ئەوە خواستی (ی. پ. یێنسن) بوو، نەک هی من. سەرەتا بە گەشتێکی دووردرێژ و ناخۆش بە ترام دەستی پێکرد. ترامەکە پڕ بوو لەو کەسانەی کە یەکشەممان دەچوونە سەیران و هەمووشیان دڵ پڕ لە هیوا سەبەتەی پڕ لە خواردنیان لەبن دەست نابوو.

کە گەیشتینە جێی مەبەست، سەرەتا هەموو ژنەکان و بەدوایاندا منداڵەکانیان و پاشانیش باوکە فەخورەکانیان دابەزین. من هەر هەستم بە ناڕەحەتی دەکرد و هیچی تر، نابەدڵ و لەشبەبار دوایان کەوتبووم. بەڵام وا پێدەچوو کە کەس، ئەگەرچیش بە ئاشکرا پیشانم دەدا و نەمدەشاردەوە، هەست بەو ناڕەحەتییەی من نەکات. (موددی) و (ی. پ. یێنسن) سەرحاڵ و بەدەم قسەوە کەوتبوونە ناو ئەو ڕیزە درێژەوە کە سەیرانکەران پێکیان هێنابوو و زۆریش بە کەیف بوون.

ورده ورده گەیشتینە جێیەکی بەرفراوانی پڕ لە سەوزەگیا کە لەوێدا خەڵکەکە هەر یەکە و بە لایەکدا بڵاوەیان لێکرد و هەندێکیان بەردەوام دەبوون و هەندێکیش هەر کە جێیەکیان دەدۆزییەوە و لێی دادەنیشتن. ئێمەش جێیەکمان بۆ خۆمان دۆزییەوە و دانیشتین.

ئەوجا دەست بە خواردن کرا، یان برسی بووین و یان برسی نەبووین و بەڵام، دەبوو بخۆین. هەرزووش سەوزەگیاکە پڕ بوو لەو دایکانەی دەهاتنە سەر چۆک و خەریکی ئامادەکردنی خواردن و سفرەڕاخستن بوون، وای لەو منداڵە پێپەتییە قاوقیژکەرانەی کە بە تاسووق و حەسوودییەوە لە یارییەکانی یەکتریان دەنواڕی، لەو باوکە دڵخۆشە مشەمشکەرانەی کە بە قۆڵی هەڵکراوەوە بەو ناوەدا دەهاتن و ڕۆژەکەیان بە یاریکردن بە سەر دەبرد. لەو کاتەدا کە (موددی) خەریکی سفرەڕاخستن و خواردنئامادەکردن بوو، ئێمە خەریکی ئەوە بووین یاری لەگەڵ یەکتردا بکەین. یارییەکە بریتی بوو لەوەی کە تۆپەکە لە دەستی من ڕاپسکێنێت و دوور دوور هەڵی بدات، ئەوجا لە جێی خۆی بوەستێت و بە فەخرەوە چاوەڕێی ئەوە بێت کە من بە ڕاکردن تۆپەکەی بۆ بهێنمەوە. کتومت وەکوو سەگێک، کە بە کەیف و خۆشییەوە دەکەوێتە کلکەلەقێ. بەڵام من وام پێشان دا کە دۆزینەوەی تۆپەکە زۆر زەحمەتە و تا کاتێک نانیش ئامادە نەکرا بە تۆپەکەوە نەگەڕامەوە بۆ لای.

(ی. پ. یێنسن)، بێگومان، خۆی بە خەمی کەرەسەکانی خواردنەوەوە بوو و بتڵە گرانبەهاکەی بەوپەڕی وریاییەوە هێنایەوە پێشەوە. با لە دەست ئەو پارچەکاغەزانەی کە پارووەکانمان تێوە پێچابوون ڕزگاری کردین کە بە

شنەشنەوە کەوتنە دەم با و بەسەر سەوزەگیاکە بە سەماکردنەوە بەرز بوونەوە، تا بە چڵوچێوی دارودەوەنەکانی دەوروبەرەوە گیرسانەوە. زۆری نەدەخایاند تا چاوی (ی. پ. یێنسن) ئەو نیگا شووشەییە دایگرت، کە هەمیشە باوبۆرانی بەسەرماندا دەقرِاند. (موددی)، وەک خۆی دەیوت، هەر بۆ ئەوەی دڵی ئەو خۆش بکات، یەک دوو پێکی لەگەڵدا هەڵدەدا، بەڵام من دڵنیا بووم لەوەی کە ئەو بۆ خۆشی حەزی لێ دەکرد. هەموو بیرەیان دەخواردەوە و پاشان نیوەبەتاڵ بە کەشخەییەوە فرِێیان دەدانە سەر سەوزەگیاکە و گەنجەکانیش بە خۆشی و گەشکەوە نیوەکەی تریان دەخواردەوە.

(موددی) و (ی. پ. یێنسن) ئەوەندە سەرحاڵ و بە کەیف بوون، کە لەوە بوو بتوانن لە رِێگای ئەو هەموو شیرینییەوە کە دەیانکرد بە دەمدا بمکوژن، ئەگەر خۆم رِێم لێیان نەگرتایە. پێم پێدەکەنین و داوایان لێ دەکردم برِۆم بۆ لای منداڵەکانی تر. لەوان دوور کەوتمەوە، بەڵام نەک بۆ ئەوەی بچم بۆ لای منداڵەکانی تر. جێیەکی تەنیا و لاتەریکم دۆزییەوە و لێی دانیشتم و پاڵم دا بە سپیدارێکەوە. سەیری دەوروبەری خۆمم کرد. سەوزەگیایەکە خراپی بەسەر هێنرابوو. درەختەکان لە کوێ بوون؟ ئەی گوڵەکان؟ سروشت لەنێو دەریای ئەو خەڵکەدا خنکا بوو. هەموو بە قاووقریشکەوە لەنێو بێدەنگییەکەیدا تەپاوتلیان بوو، چڵوپۆپی درەختەکانیان دەشکاند، گوڵەکانیان لە ژێر پێ دەنا و منداڵەکانیش بە کەیف و خۆشییەوە لە هەموو شوێنێک و بە هەموو شتێکدا دەمیزان. بەر لەوەی خەو بمباتەوە، وام هێنایە بەر خەیاڵی خۆم کە درەختەکان بە تاسە و ئارەزووی هاتنی

دووشـەممەوەن، تا بتوانـن بگەڕێنەوە بۆ ناو ژیانە کشومات و بێدەنگەکەی خۆیان.

بەدەم ئەوەوە کـە کـچـێکی بچکۆلـە لەلامـەوە وەسـتـابوو و پرچەکـانـی ڕادەکـێـشـام، خـەبەرم بووەوە. گـەڕامـەوە بۆ لای (موددی). ئەو و (ی. پ. یێنسن)یش بۆ ماوەیەک خەویان لێ کەوتبوو. سەروسیمایان هەڵاوساو و سوورهەڵگەڕاو بوون. شەرمم کرد سەیریان بکەم و وەکوو ئەوە وا بوو کە نووستنی بەر خۆرەتاو تەواو ڕووتوقووتی کردبنەوە. (موددی) بە کەیف و خۆشییەوە وتی: بەر لەوەی بچین بۆ (باکن) سەر و قاوەی تر دەخۆینەوە و تەرمۆسەکەی هێنایە پێشەوە. بەڵام (ی. پ. یێنسن) قاوەی نەویست. ئەو گەیشتبووە ئەو جێیەی کە ئیتر بێـجگە لە (برێنڤین)[×] و بیـرە هیـچی تر نەخـواتەوە. (موددی)یش بە خۆشییەکەوە وتی: کەیفی خۆتە و خۆشی وا پێشـان دا کـە هیچ دەربەسـتی ئەوە نییـە، ها ئێـستـا نا نەختێکی تر شەڕ و هەرامان بەسەردا قڵپ دەبێتەوە. من بە تەماشاکردن ویستم ئاگاداری بکەمەوە و بەڵام ئەو نەیویست لە ئاگادارکردنەوەی نێو چاوەکانی من تێ بگات.

کـە ڕۆیشـتین بە خـواسـتی دڵی خـۆی دەسـتی دایە سـەبەتەکـە و هەڵیگرت، کە بێگومـان زۆر سـووکـتـر بووبوو لەوەی مـاڵەوە. دەی خـۆ دەتوانیت سـەبەتەکـە بۆ باوکت هەڵبگریت، (موددی) بە دەنگێکەوە وەکوو ئەوەی هانم بدات وتی و منیش بە سـەروسـەکـوتێکی مـۆن و گـرژەوە وتم: مـاندووم و با *(ئەو)* خـۆی هـەڵیـبگرێت. یەکسـەر (ی. پ. یێنسن) دەسـتی لە سـەبەتەکـەی بەر دا و داینا و ئیـتـر باووبۆرانیش بەسەرماندا قڵپ بووەوە.

× برێنڤین، جۆرە مەشروبێکی قورسە.

بە جۆرێک کە هەموو ئەوانەی دەوروبەرمان بتوانن بیبیستن، نەڕاندی بەسەرمدا: *(ئەو)*! بە کێ دەڵێت: *(ئەو)*! هەندێکیشیان ڕاوەستان و گوێقولاغ بوون. (موددی) وتی: بێ دەنگ بە! پێویست ناکات بەو شێوەیە بقیژێنێت! ئەویش بەسەریدا نەڕاندی: تۆ دەمت داخە! و ئەوجا بە تووڕەیی و گژرییەوە ڕووی کردەوە من. دەبێت فێری شەرم و حەیا بێت و دووبارەی کردەوە بە کێ دەڵێیت: *(ئەو)*! چاوەکانیشی بە خواردنەوە و بەدکاری سوور و شووشەیی بووبوون. ڕقم لێی دەبووەوە، بەڵام لەوە بچووکتر بووم ڕق و کینەی خۆمی پێشان بدەم. لەبری ئەوە سەرلێشواو و بە شەرمەوە سەیری ئەرزەکەم کرد.

(موددی) وتی: داوای لێبووردن لە باوکت بکە! ناچار بووم داوای لێبووردنی لێ بکەم و پێنج جاریش لەسەر یەک بڵێم: بابە. دوای ئەوە دڵم تێکەڵ و پێکەڵ هات و ناچار لە ڕێگاکە لام دا و دەستم کرد بە ڕشانەوە. ناخم دەیچریکاند: ڕقم لێتە، ڕقم لێت دەبێتەوە. (موددی) زاتی نایە بەر خۆی و پێی وت: نایبینیت کە دەڕشێتەوە و دڵی تێکەڵ دێت؟ ئەویش هات بە لامەوە و وتی: وەرە! با هەمووی لە بیر خۆمان ببەینەوە و بچین بۆ (باکن) نەختێ بای باڵی خۆمان بدەین. بۆشت هەیە هەموو یارییەکان بکەیت و سەیری (میستەر یاکل)یش بکەیت.

کە گەیشتینە (باکن)، یەکسەر بەرەو شانۆی بووکەشووشەکانی (میستەر یاکل) ڕامکرد و کەچی ئەو لەو کاتەدا گفتەکەی خۆی لە بیر چووبووەوە و لەبری ئەوە بەرەو یارییەکانی تر، کە خۆی زۆر کەیفی پێیان دەهات، پەلکێشی کردم. هێندەشی نەبرد دەستەکانم پڕ بوون لە شتی هیچ و

بێکەڵک. ئەو خۆی بە شانازییەوە لە تەنیشتەوە ڕێی دەکرد و پاسی هەموو شتەکانی دەکرد. یەک لەسەر یەکیش دەیپرسی: حەزت لێیان نییە؟ بە هەناسە بۆن ناخۆشەکەی سەروچاوی دەپێچامەوە. سەراسیمە و ماندوو بە چرپە دەموت: با! ئەو وتی: ئێستا شەربەتت بۆ دەکرم و ئەوەندەش کولیچەی پێوە بخۆ تا دەتوانیت. دەموچاوی (موددی) گەشابووەوە. دەمتوانی لە دەموچاویدا بیبینم کە بیری دەکردەوە: ئێستا ئیتر هیچ خەمێکم نەما.

(ی. پ. یێنسن) دڵ پڕ لە چاوەڕوانی سەیری منی کرد و بەخۆنازینێکەوە تەماشای مەیگێڕەکەی کرد: دوو بیرە و پەرداخێک شەربەتمان بۆ بێنە و ئەوەندەش کولیچە و کێک کە ئەم منداڵە بتوانێت بیخوات. بەڵام هێندە ماندوو بووم کە دڵم لەو هەموو کێک و کولیچەیە تێکەڵ دەهات کە بۆم داوا کرا. مەیگێڕەکە بە هەڵە شتی تری لە بەردەمدا دانا‌ین و ڕێک ئەوەش بوو کە (ی. پ. یێنسن) چاوەڕوانی بوو بۆ ئەوەی بیانوویەک بدۆزێتەوە و پێیدا هەڵشاخێت. حەزی لەوە بوو بە گژ مەیگێڕاندا بچێتەوە و بەرۆکیان پێ بگرێت و بۆ ئەو گرنگیش نەبوو مەیگێڕەکە چی دەکرد و نەدەکرد، هەرچییەکی بکردایە هەر بە خراپە بە سەریدا دەشکایەوە. (موددی) هەوڵی دا بێدەنگی بکات، بەڵام بێهوودە بوو. گڕکانێک بوو و نەتدەتوانی بەری پێ بگریت. داوای لێ کرد: ئەوەندە مەخۆرەوە. ئەو نەڕاندنی بەسەریدا: من بڕیار دەدەم نەک تۆ! و بە مشت کێشای بە مێزەکەی بەردەمیدا و هەرچی شووشە و پەرداخ بوو بەربوونەوە. هەوڵمان دا لەگەڵ خۆمان بیبەین بۆ جێیەکی تر، بەڵام بۆمان نەچووە سەر. قیژاندی بەسەرماندا: بە کەیفی خۆمە و هەموو ئێوارەکە لێرە

دادەنیشم و ئەگەر تۆ و ئەویش نارازین جا بە جەهەنەم و دەتوانن ملی خۆتان بشکێنن و بڕۆن! چاوی (موددی) پڕ بوون لە فرمێسک. ڕێک لەو کاتەشدا چاوی بە مەیگێڕەکە کەوتەوە و ڕووی لە پاسەوانی بارەکەش کرد و بە تووڕەییەوە وتی: ئەمە چ خزمەت و بەدەنگەوەهاتنێکە! هەر ئێستا بیرە و پێکەکەم بخەنە بەر دەست! (موددی) وتی: ئەرێ ناتوانیت نەختێک لەگەڵ ئەو مەیگێڕە بەستەزمانەدا لەسەرخۆتر بیت. هەستایە سەر پێی و بە لاچاو و پڕ کینەوە سەیری کرد و قیژاندی: ون بە لەبەر چاوم و ئەو منداڵە سپڵە و پێنەزانەش لەگەڵ خۆت بەرە!

بە پەلە چووینە دەرەوە.

کە هاتینەوە ماڵەوە دەستی کرد بە گریان و قسەی ناشیرین پێوتنی و وتی کە دەیەوێت لێی جیا بێتەوە. منیش هەر سەیرم دەکرد و لێی ورد دەبوومەوە. ئەوجا عەقڵ و هۆشم لەبەر هەڵگیرا و وتم: ئاخۆ بەبێ ئەو چەند باشتری بەسەر بەرین، ئاە ئەگەر بمردایە و نەجاتمان بووایە لە دەستی! (موددی)یش ڕێک لەو کاتەدا ڕووی لێ وەرگێڕام و وەک شێت و هار بەسەرمدا قیژاندی: ئاوا! دەتەوێت بمرێت! ڕاوەستە بزانە چۆن بۆی دەگێڕمەوە! و بە هەموو توانای خۆی کەوتە سەروگوێلاکم. لە هیچ شتێک تێنەدەگەیشتم. بەڵام پێش ئەوەی خەو بچێتە چاوم ئەوەم دەژمارد کە سێ هەفتەی تری ماوە بۆ یەکشەممەی داهاتوو، یەکشەممەی دەستەبەتاڵیی (ی. پ. یێنسن).

***لە پێشدا گوێم لێ بوو*** کە لە دەرگا دەدرا، پاشان گوێم لە دەنگە زیت و وریاکەی خۆم بوو: (موددی)، لە دەرگا دەدرێت. دوای ئەوەش گوێم لە دەنگە ناسکەکەی ئەو بوو: لە دەرگا دەدرێت؟ ئاخۆ کێ بێت بەم ناوەختە لە دەرگا بدات؟ و بە کەیف و چاوەڕوانییەوە دەرگاکەی کردەوە.

هەم ترسام و هەمیش، کاتێک لە دەرگا درا، گوێقولاغ بووم و زیت و وریا بوومەوە. چەند شتی سەیر و سەمەرە، لەگەڵ لێدانی دەرگادا، خۆی نەکردووە بە ماڵماندا! خۆم فێر کردبوو کە کاتێک لە دەرگا دەدرا، دەبوو بڕۆم و بیکەمەوە، بەڵام کاتێک لە دیوارەکەمان دەدرا، لە ئەرزەکە و لە ژێر کورسییەکەم دەدرا، نەمدەزانی پەنا بۆ چی بەرم و بە چی وەڵام بدەمەوە. بەڵام (موددی) هەمیشە دەیزانی چی بکات و چۆن وەڵام بداتەوە.

هەندێک جار ئەوەش ڕووی دەدا، بەبێ ئەوەی کەس لەودیو دەرگاکەوە هەبووبێت، لە دەرگا دەدرا. لە کاتی ئاوهادا من و موددی هەر ئەوەندەمان پێ دەکرا، چاو لە ڕاڕەوە دوورودرێژ و تاریکەکەی بەر دەرگاکە ببڕین و ئەوجا ئەو بەوپەڕی خۆشییەوە دەیوت: کەسی لێ نییە! هەبێت و نەبێت، دەبێت ئەوە دەستی یەزدان بووبێت و بە دەرگاکەی ئێمە گەیشتبێت، بەڵام نابینم کە هیچ خاچێکی لەسەر دەرگاکە کێشا بێت، کەواتە هێشتا وەختی مردنی کەسمان نەهاتووە.

ئەگەر لە دیوارەکەمان بدرایە، دەیوت: ئێستا سیسرکەکان یەکێک لە مردووەکانی خۆیان دەنێژن. ئەگەر لە ئەرزەکەمان بدرایە، لێی دەدایەوە و دەیوت: هەر ئەوەندە وەڵامیان بدەیتەوە، ئیتر دەست هەڵدەگرن و پێیدا ناکێشن. بەترسەوە لێم دەپرسی و زۆر چاکیش دەمزانی وەڵامی چییە: کامانە؟

دەیوت: بێگومـــان، ڕۆحـی مـــردووەکـــان. ئەگـــەر لە ژێر کورسـییـەکەشم بدرایە، بە پێکەنینەوە دەیوت: دەی ئێسـتا دەبێت بگوێزیتـەوە بۆ کورسییـەکەی تر، چونکە لەوە دەچێت کـەسێک بیەوێت کورسـیـیـەکـەت لێ قـەرز بکات! منیش بۆ کورسییەکی دیکە دەمگواستەوە.

ئێـوارەیەکیـان بە خـەبەر هـاتم و گوێم لە (مـوددی) بوو بە هاورێیـەکی خـۆی دەوت: بیــهـێنەرە پێش چاوی خـۆت، شـەوێکیان دەوروبەری سـەعات دووی شـەو لە دەرگا درا و کە کردمەوە؛ خوشکی مێردەکەم، لەنێو دەرگاکەدا ڕاوەستا بوو و تاڵەخوێنێکیش بە لاملیدا هاتبووە خوارەوە ــ

تا توانیم خـۆم بە ژێر لێفـەکەدا کردەوە و نەمـویست زیاتر لەبارەی (خـوشکی مێردەکـەم)ەوە ببیسـتم، چونکە ئەو دایکی ڕاستەقینەی خۆم بوو و زۆریش لە دنیا سـەیر و سەمـەرەکەی دەترسام.

هـەندێک جار بە کاغـەزەکان یارییەکیان دەکرد و بەدەم ڕاز و نهـێنییـەکەوە بە مـێـزەکـەیاندا دەکێـشـا، ئەوەی لە کـاتی خـۆشـیدا بە مێزەکـەیدا نەکێشـایە، دەیدۆڕاند و لە یارییـەکە دەکرایە دەرەوە. ئەوجـا ئەو مـێزە پڕ لە ڕاز و نهێنییـە هەبوو کە زمـانی لێـدان و پێداکێشـانی دەزانـی، بەڵام دەبووایە خـڕ بووایە. هاورێیـەکانـی موددی دەیانوت: مـێزی خـڕتان زۆرە و بۆ ئەو کارەش یەکاویەکن، بەڵام من لە (موددی) دەپاڕامـەوە و داوام لێ دەکـرد کـە کـارێک نەکـەن هـیچ مـێـزێک لـە مـاڵی ئێـمـەدا لێ بدات. لـەبری ئەوە (مـوددی) چـوو بۆ لای ئەوان و گوێی بۆ لێدانی مێزەکانی ئەوان دەگرت.

پێـیـان دەوتم: کـە گـەیشـتـیـتـە ئەوێ دەبێت بە نەرم و نیانییـەوە لە دەرگا بدەیت و چاوەڕێ بیت تا بە دەنگتەوە دێن.

منیش بە نەرمی و هێواشی لە دەرگاکەم دەدا و لە لێدانەکەی خۆم، لەو بێدەنگییەی، ئەگەر کەس لە ماڵ نەبووایە، پشتی دەرگاکەی داگرتبوو دەترسام، لەو وەڵامە دەترسام کە دەدرامەوە، ئەگەر کەسێک لە ماڵەوە بووایە. هەندێک جار لەگەڵ کردنەوەی دەرگاکەدا، ناو دەرگا پڕ دەبوو لەو منداڵانەی پێم پێ دەکەنین. هەندێک جاریش کە دەرگا دەکرایەوە، گەورەیەک پەلکێشی دەکردم و چنگی پڕ دەکرم لە شیرینی. هەندێک جار بە لای منداڵێکی ساواوە دایاندەنام بۆ ئەوەی ئاگام لێی بێت، ئەویش ئەوەندەی دەقیژاند کە پێم وا بوو ها ئێستا نا نەختێکی تر دەمرێت. هەندێک جار دەیانبردەمە ژوورێکی تاریک و گەورە و بە تەنیا لەنێو ئەو کورسی و وێنە جۆراوجۆرانەدا بە جێیان دەهێشتم، کە پێیان نائاشنا بووم. جارێک لە جاران ئەوەندە لە ژوورێکی وادا چاوەڕێم کرد کە پێم وابوو لە بیریان کردووم و بە چەپۆک بەر بوومە گشت دەرگاکانی ژوورەکە. کاتێکیش کە کەس وەڵامی نەدامەوە، یەکێک لە دەرگاکانی ژوورەکەم کردەوە و بەڵام، بەپەلە دامخستەوە: ئاخر نەمدەزانی کە گەورەکان بە ڕووتوقووتی لە تەنیشت یەکترەوە دەنوون!

***ئێوارەیەکی زستان*** من و (موددی)، لە دەوری مێزە خڕەکە و لە ژێر چرای بنمیچەکەدا دانیشتبووین. (موددی) خەریکی گۆرەویچنین بوو، سەبەتەیەکی پڕ لە شلیلە و خوریی گۆرەویی تازەشۆردراوی لە پێش خۆی دانابوو. چرای بنمیچەکە، وەک ئەوەی بایەکی نادیار دیلانێی پێ بکات، کەمێک بەملا و ئەولادا دەهات و تارماییەکانیشی وەکوو تەنکەدووکەڵ بەسەر دیوارەکاندا هەڵدەگەڕان. (موددی) دەستی چەپی کردبوو بەناو گۆرەوەییەکەدا و دەستی تێدا تۆپەڵ کردبوو و وەکوو تۆپەوانەیەک بۆ ڕێکخستنی بەشی لای پاژنەی گۆرەوییەکە بە کاری دەهێنا و هەرجارێکیش کە شیشەکەی بە خۆی و دەزووە درێژکۆلەکەی دوایەوە لە گۆرەوییەکەوە بەرز دەکردەوە، قۆڵی سێبەری بەسەر دیوارەکەدا دەکێشا و مارئاسا پێچاوپێچ بە دیوارەکەدا هەڵدەکشا و وەکوو تەورێکی دەسکدرێژیش بەرەوخوار بەسەر دیوارەکەدا دادەکشایەوە خوارەوە.

ماوەیەک بوو بێدەنگ، هەریەکە و سەرقاڵ بە خەون و خەیاڵاتەکانی خۆیەوە، دانیشتبووین، کە یەکسەر یەکێک، سێ جار لەسەر یەک بە کورتی و بەڵام بە دڵنیاییەوە، لە دەرگاکەی دا.

بە خۆشییەوە وتم: (موددی) لە دەرگا دەدرێت! و دڵ پڕ لە چاوەڕوانییش تەماشام کرد.

(موددی)یش، بە دەنگێکی پڕ لە خۆشی و چاوەڕوانییەوە، وتی: ئاخۆ کێ بێت لە دەرگا بدات! و کەرەسەکانی خستە لاوە و لە کورسییەکەی بەرز بووەوە و لەسەر نووکی پێ و بە چەند هەنگاوێک، لە کاتێکدا کە دووبارەی دەکردەوە: ئاخۆ کێ بێت؟ بەرەو دەرگاکە ڕۆیشت.

دڵ پڕ لە چاوەڕوانی لە دوای (موددی)م دەڕوانی و بە تاسە و ئارەزووی ئەو شتە خۆشانەشەوە بووم کە ئەو، کاتێک میوانێک ڕووی تێ دەکردین، لە بەردەمی دادەناین.

بەڵام کە (موددی) دەرگاکەی کردەوە، کەس لەبەر دەرگاکە نەبوو. سەیری چەپ و ڕاستی ئەودیوی دەرگاکەی کرد، چاوی لە تاریکایی ڕاڕەوی هەورەبانەکە بڕی، سەری لار کردەوە بۆ ئەوەی گوێ بگرێت، بەڵام نە هیچی بینی و نە هیچیشی بیست.

(موددی) وتی: شتێکی سەیرە، تەنانەت پشیلەیەکیشی لێ نییە! ئەوجا دەرگاکەی داخستەوە و وتی: دەبێت بە هەڵە بیستبێتمان!

بە کەمێک دوودڵییەوە دەستی دایەوە کەرەسەکانی و دەستی بە چنینی گۆرەوییەکانی کردەوە، ئاواتی منیش نەهاتە دەی، بەڵام کەمێکیش دوودڵی دایگرتم و خۆم لە (موددی) نزیکتر کردەوە.

ڕێک لەو کاتەدا کە بێدەنگی ژوورەکەی داگرتبووەوە، لە دەرگا درایەوە: سێ جار بە توندی. ئەمجارەیان لەنێوان هەر لێدانێکدا نەختێک ڕادەوەستا: لەوە نەدەچوو دەنگەکە لە بوونەوەرێکی ساغ و ڕووخۆشەوە بێت.

بە دڵەڕاوەکەوە تەماشای (موددی)م کرد.

وەک ئەوەی بیەوێت نەختێک خۆی بێترس و ئارخەیان پێشان بدات، (موددی) وتی: تۆ بیکەرەوە! ئەگەر خێویش بێت، هیچ خراپەیەک لەگەڵ منداڵێکی بێگوناھ ناکات!

سەری نارەزاییم ڕاوەشاند. (موددی) پەلی گرتم و پێکەوە بەرەو دەرگاکە ڕۆیشتین و کردمانەوە.

ئەمجارەش کەس لەودیو دەرگاکەوە نەبوو، بەڵام من پێم وابوو کە شتێکی سارد نیشانەیەکی لەسەر نێوچەوانم کێشا

و به ترس و لەرزەوە خۆم به (موددی)ـەوە، کە یەکسەر دەرگاکەی دایەوە بەیەکدا، نووساند. ئەمجارەیان هیچ خەمی ئەوەشی نەبوو سەیری ڕاست و چەپ بکات. لەبری ئەوە بە خێرایی چەند جارێک کلیلەکەی بادا و دەرگاکەی لەمدیوەوە توند کرد.

پاشان پێکەوە و لەسەر نووکی پێ خۆمان گەیاندەوە مێزە خڕەکە و لێی دانیشتین. زۆر ترسام لەوەی کە ئەوەی لەودیو دەرگاکەوە نەبوو، ئەگەرچی دەبوو لەوێ بووایە، گوێی لێمان بێت و ڕەنگ بێت ڕێمان نەدات لە دەرگاکە دوور بکەوینەوە.

کە گەیشتینەوە لای مێزەکە (موددی) چرپاندی بە گوێمدا: ئەگەر لێش بدرێتەوە، نایکەینەوە! من تەنانەت زاتی ئەوەم نەبوو دەمیش بکەمەوە، بەڵکو هەر بە سەرڕاوەشاندنێک ڕەزامەندیی خۆم پێشان دا.

(موددی) لە شوێنی خۆی دانیشتەوە، بەڵام دەستی بۆ کارەکەی نەبردووە و هەر بە واقوڕماوییەوە بە ژوورەکەیدا دەڕوانی و منیش بەدەم لەرزەوە لەنێوان هەردوو قاچیدا ڕاوەستابووم و هەردووکیشمان بەدەم چاوەڕوانیی لێدانەوەی دەرگاکەوە دڵمان لە خورپەدا بوو.

لەپڕێکدا موددی بە دەنگێکی بەرز کە منی لە جێی خۆم ڕاچڵەکاند وتی: ئا لاچۆ! با بڕۆم بۆ موبەق و شتێکی خۆش بۆ خۆمان دروست بکەم!

ئەوجا بە پەلە لە ژوورەکە چووە دەرەوە. لە ترسی ئەوەی بە تەنیا بە جێ بهێڵرێم، بەپەلە دوای کەوتم و ڕێک لەو کاتەشدا کە خەریک بوو دەگەیشتمە موبەقەکە، پێم وابوو کە یەکێک لە پشتەوە دەمگرێت و چرپاندم بە گوێی (موددی)یدا: ڕەنگە *(ئەو)* هاتبێتە ژوورەوە!

(موددی) بەدەم پێکەنینێکی ساختەوە پرسی: کام ئەو؟ خۆ خۆت بینینت کە کەس لەودیو دەرگاکەوە نەبوو!

زمانم کەوتە تەتەڵە و وتم: بەڵام خۆ ئەگەر خێو بێت، ناتوانیت ببینیت!

(موددی) بە دڵنیاییەکەوە وتی: نا، با لە بیر خۆمانی بەرینەوە، ڕەنگە کەسێک بووبێت و ویستبێتی نەختێک گاڵتەمان لەگەڵدا بکات، بەڵام ڕێک لەو کاتەدا کە ویستی دەرگای ژوورەکە دابخات، بۆ جاری سێیەم لە دەرگا درایەوە. ئەمجارەیان لەنێوان هەر لێدانێکدا، زیاتر ڕادەوەستا و وەک ئەوە وابوو ئەوەی کە لە دەرگاکە دەدات بیەوێت بەو ڕاوەستانانەی نێوان لێدانەکان شتێکی گرنگتر لە لێدانەکان بڵێت و بەو شێوەیەش زیاتر بمانترسێنێت.

بەدەم لووشکەلووشکەوە زیاتر خۆم بە (موددی)یەوە نووساند. ئەو گرتمیە باوەش و لێوەکانی بە شێوەیەک لێ کرد وەک ئەوەی پێم بڵێت: بێ دەنگ بە! منیش بێ دەنگ بووم و تەنیا شتێک کە گوێمان لێ بوو دەنگی هەناسەبڕکێی پڕ لە ترس و لەرزی خۆمان بوو.

چاوم لە قووڵایی ژوورەکە بڕیبوو. لە ژوورەوە تارماییەکان بە گورج و گۆڵی و لەشسووکییەوە لەسەر ئەرزەکە و دیوارەکان سەمایان دەکرد و وەک ئەوە وابوو کە تارماییەکان لەو کاتەدا هەست بە ئازادییەکی زیاتر بکەن کاتێک کە ژوورەکەیان بۆ چۆڵ کرابوو و لەوان زیاتر کەسی دیکەی تێدا نەبوو. چراکەش، وەک ئەوەی کە کەسێک لەو کاتەدا دەستی لێ دابێت، زیاتر بەملا و ئەولادا دەهات و جارجاریش شیشی گۆڕەوچنینەکەش لەنێو ئەو گۆڕەوییەدا کە لەولاوە دانرابوو بە تەواوی دەدرەوشایەوە.

نا، نەمدەوێرا بچمەوە ناو ژوورەکە و هەر چۆنێک بێت لە موبەقەکەدا دڵنیاتر بووم، جار لە دوای جار چاوم لە ئاستی یاریی ترسناک و تۆقینەری تارماییەکاندا دادەخست، بەڵام هەرجارێک بە پەلە دەمکردنەوە و نەشمدەزانی کامیان ترسناکترە: سەیرکردن یان سەیرکردن.

ئاه، چەند بە ئاواتەوە بووم (موودی) دەرگای ژوورەکە دابخات و هەر بە تەنیا موبەقەکەمان بۆ بمێنێتەوە تا پاسی بکەین و بێجگە لەوەش بە ئاواتەوە بووم کە موبەقە ژوورێکی بچکۆلەی هەبووایە کە بمانتوانیایە خۆمانی تێدا بئاخنین و ئەو ژوورە بچکۆلەیەش ژوورێکی بچکۆلەتری تایبەت بۆ ئێمەی هەبووایە؛ ئا، بە ئاواتەوە بووم ئەو ژوورە هێندە بچکۆلە بووایە کە تەنیا جێی من و (موودی) تێدا ببووایەتەوە، بەڵام لە هەموو شتێکیش دڵنیاتر ئەوە بوو کە من بۆ خۆم لەنێو لەشی (موودی)یدا بوومایە!

وا توندیش خۆم بە (موودی)ـەوە نووساندبوو، وەکوو ئەوەی لەڕاستیشدا بمەوێت خۆم بەناو لەشیدا بکەم. ماوەیەکی درێژ پێکەوە بە بێدەنگی دانیشتین: ترساین و لەگەڵ ئەوەشدا کەمێک بە ئامادەبوونی یەکتری هەستمان بە دڵنیایی کرد.

لەپڕێکدا دەنگی هەناسەبڕکێیەک لە ژوورەکەوە، وەکوو ئەوەی کەسێکی نامۆ لە ژوورەکەدا بێت، هاتە بەر گوێمان؛ بە ترس و لەرزەوە تەماشای ژوورەکەمان کرد و بینیمان کە تارماییەکان وەکوو ئەوەی کەسێک دوایان کەوتبێت و ڕاویان بنێت کەوتبوونە ترپەترپ، بەڵام هاوکاتیش تا دەهات کاڵتر دەبوونەوە و کاتێکیش بە لاچاوێک سەیری چرای بنمیچەکەمان کرد، بینیمان کە ڕووناکییەکە خەریکە

دەکوژێتەوە: چراکە زمانێکی لە دووکەڵی ڕەشی درێژی قەترانی درێژ کردبووەوە. لە خۆشیاندا ئاهێکمان بە بەردا هاتەوە: هەناسەبڕکێ و ترپەترپەکە لە ڕووناکایی چراکەوە، کە بەرەو کوژانەوە دەچوو، دەهات!

(موددی) وەکوو ئەوەی لە دەست شتێک ڕزگاری بووبێت، هەستا؛ بەڵام کاتێک ویستی بچێتە ژوورەکەوە تا نەوت بکاتە چراکەوە، توند توند خۆم پێوە نووساند: بۆی نەبوو بچێتە ژوورەوە!

لە کاتێکدا کە (موددی) دەیویست ڕازیم بکات بەوە کە لەگەڵیدا بچمە ژوورەوە، گوێمان لە دەنگێکی تر بوو، دەنگێک وەکوو ئەوەی لە جادەکەوە بێت! ئەوە دەنگی غارکردنی ئەسپێک بوو کە سمە ناڵکراوەکانی دەکێشا بە بەردەڕێژی شەقامەکەدا و زایەڵەی دەهات و وەکوو ئەوەش وا بوو کە ئەسپەکە لە ماڵەکەی ئێمە نزیک بێتەوە، چونکە تا دەهات دەنگەکە زیاتر بەر گوێمان دەکەوت. ئەوجا لەوە بوو ئەسپەکە لەبەر ماڵەکەماندا ڕاوەستابێت، چونکە لەپڕێکدا دەنگ نەما و کشومات بوو.

پاش نەختێک ئەسپەکە بە غارغارێن دوور کەوتەوە و دەنگەکەش تا دەهات دوورتر دەکەوتەوە، منیش ئەوەندە گوێم بۆ غارغارێنی ئەسپە شل کردبوو، کە لە خەیاڵی خۆمدا هەردووکمان فریای ئەوە کەوتبووین خۆ هەڵدەینە سەر پشتی و خۆ دەرباز بکەین.

ڕێک لەو کاتەدا کە دەنگی ئەسپەکە خامۆش بوو، لە ژوورەکەوە گوێم لە ئاهەهەڵکێشانێکی قووڵ بوو و ڕووناکاییەکەش بەتەواوی کوژایەوە.

(موددی) بە تەواوی بەسەر ترسەکەیدا زاڵ بووبوو و بە

دەنگێکی کـــراوەوە وتـی: دەزانیت چی، پێم وایە ئەســپــەکــە هاتبــوو بۆ ئەوەی ئەو خــێــوە لەگـەڵ خـــۆیدا ببــات کــە لە دەرگاکەی داین، چونکە بێگومان خێوەکە ڕێی هەڵە کردبوو و ڕێی کــەوتبــووەوە ئەم دەوروبەرانە. پاشـــانیش وتـی: وەرە با بچین چراکە هەڵکەینەوە!

بە نابەدڵیــیــەوە دوای کـەوتم. (مــوددی) بۆ دڵنیـایی، ئەو شــەوە، چراکــەی نەکــوژاندەوە. چیــتــریش دەنگی لێــدانی دەرگاکەمان بەر گوێ نەکەوتەوە.

***دوانزە ساڵان بووم***، بەسەر جادە بەردەڕێژکراوەکەدا دەڕۆیشتم و تیشکی هەتاو لە تەختی نێوچەوانمی دەدا، لە لایەکمەوە، دەریاچەکە، ڕەنگ پۆلایین، وەکوو دەمەچەقۆیەک دەدرەوشایەوە و لە لایەکەی دیکەشمەوە، دیواری تاریکی دەرەوەی ماڵەکان و (ئێرنا)ی زۆربلێ بوو، بە خۆی و کراسە کونجکونجەکەیەوە.

هەموو شتێک ئاسایی دەینواند. دوانیوەڕۆیەکی ئارام و هێمن و دوو کچی دوانزە ساڵانیش هەریەکە و بە خۆیان و خەونە بەربڵاوەکانیانەوە. تا ئەو کاتەی ڕووم بە لای دیواری تاریکی دەرەوەی ماڵەکاندا وەرنەگێڕا، هیچ شتێک، بە هیچ جۆرێک، سەرنجڕاکێش نەبوو، ئەوەی لەوێشدا ڕووبەڕووی بوومەوە هەموو لەشی پڕ کردم لە ژان و کوڵ.

لە (ئێرنا)م پرسی: ئەوە کێیە؟ و ئاماژەم بۆ ئەو کوڕە سیانزە ساڵانەیە کرد کە سەری بەرەو دەروازەیەک لار کردبووەوە و بە چاوی پڕ لە خەون و خولیاوە لە دەریاچەکەی دەڕوانی. وەک ئەوەی لە مەڕمەڕ هەڵکەنرابێت و بێ ئەوەی بە هیچ جۆرێک لە قەشەنگیی خۆی بەئاگا بێت، ئەو قەشەنگییە بالایەی کە ئازاری منی دەدا، لە جێیەکەی خۆیدا ڕاوەستابوو. دەمویست دەستی تێوە بدەم. بەڵام (ئێرنا) هەر ئەوەندەی وەڵام دامەوە: ئێێش، ئەوە تەنیا (فرانک)ە و هیچی تر، هەقت نەبێت بە سەرییەوە، ئەوەندە گرنگ نییە! و پاشان بەرەوپێش لەگەڵ خۆیدا بە کێشی کردم.

قەت بەخت نەبووە یارم تا قسەیەک لەگەڵ (فرانک)دا بکەم، بەڵام زۆرجاران لەوێدا ڕاوەستام و بە دزییەوە تەماشام کرد و هەمیشەش دوای ئەوە خەمینی دایدەگرتم و دڵپەست دەبووم.

***کێ دەیەوێت یاریم لەگەڵ بکات***؟ کێ دەیەوێت یاریم لەگەڵ بکات؟ قیژاندیان و وەک باگێژەی شاد و خەنی بە سەماوە ڕێیان کرد، منیش پڕ بە دڵ دەمویست هاوار بکەم: من دەمەوێت! من دەمەوێت! بەڵام لێوەکانم نەیاندەخواست قسە بکەن، قاچەکانم نەیاندەخواست ڕا بکەن. ئەگەرچی پڕ بە دڵ دەمویست یاری بکەم، بەڵام تەنیا ئەوەندەم پێ کرا لەوێدا بە دەمداپچڕاوییەوە، وەک ئەوەی پێیەکانم لە شەقامە بەردینەکە ڕوا بن، ڕاوەستم و هەست بکەم: چەندێ حەزم بە یاریکردن دەکرد.

بەڵام زۆربەی یارییەکان هەر هێندەیان لە دەست دێت ئازار بدەن! نەمدەتوانی بەشداریی پێکەنینی هەندێک، گریانی هەندێکی تر؛ خەمباری هەندێک، شادی هەندێکی تر؛ بکەم. ئەو یارییە تەنیا ئازار دەبەخشێت و هیچی تر. کێ دەتوانێت، کاتێک هەورەبانەکە پڕە لە خێو، پێبکەنێت! کێ دەتوانێت بەو گۆرانییە پێبکەنێت کە پڕە لە گریان! کێ دەتوانێت، پاییزان، بە کەشتیی چارۆکەداری ڕووڵەمەرگی (قوو)ەکان پێبکەنێت! بە گوڵە پێشێلکراوەکانی باخچە و، بە چاوی پلیشێنراوەی کەستانییەکان پێ بکەنێت! کێ دەتوانێت بەو سەگانە پێبکەنێت کە دەلوورێنن، بەو هێلکەشەیتانۆکانە پێبکەنێت کە هەرگیز ناوێرنماڵەکانیان بە جێ بهێڵن! کێ دەتوانێت بە برووسکە پێ بکەنێت، ئەو برووسکەیەی زمانی ئاگر دەپەیڤێت، کێ دەتوانێت پێ بکەنێت، کێ!

بەڵام من دەمەوێت، بە کامی دڵ پێ بکەنم. لەسەرم بکە. یارمەتیم بدە تا بتوانم گورج بدەمە بەر خۆم و بەشداری یارییەکەت بم! لەسەرم بکە!

تەنانەت لەگەڵ هاوڕێکانیشمدا، کاتێک لە جەژنی

لەدایکبوونمدا دەهاتن بۆ ماڵمان، نەمدەوێرا یاری بکەم، هەر ئەوەندەم پێدەکرا بێدەنگ لە پەنایەکدا دانیشم و بە هیوای ئەوە بم بەزوویی بڕۆن و وازم لێ بهێنن. نەمدەویست دواکەس بم و لە دوای هەمووانەوە لەسەر کورسییەکەم هەڵبستم و بە جێی بهێڵم. نەمدەویست ئەوە بم کە چاوی دەبەسترایەوە و دەبوو بەدوای ئەوانی تردا بگەڕێت. نەمدەویست دوای یاسا و ڕێسای یارییەکان بکەوم، ئەوسا، وازیان لێ دەهێنام و دەڕۆیشتن، ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە هەرگیز نەمدەویست وازم لێ بهێنن!

**بە هیچ جۆرێک** لەوە تێنەگەیشتم کە بۆچی بۆمان نەبوو لەگەڵ ئەو پیاوە ڕووخۆشەدا بڕۆین و ئەو شۆکولادە بخۆینەوە کە پڕ بە دڵ حەزی دەکرد لەگەڵ ئێمەدا بیخواتەوە.

من و (کارین)، دوو سەعات بوو، لەگەڵ یاریی خلیسکێنەدا خەریک بووین و کاتێکیش کە لەشمان گەرم داهات، ماندوو بووین و خۆمان چەماندەوە بۆ ئەوەی پێڵاوی خلیسکێنەکانمان لە پێمان دابکەنین، کتوپڕ، بۆ ئەوەی یارمەتیمان بدات، لە بەردەمماندا قوت بووەوە و دەستی یارمەتی بۆ درێژ کردین. پاشان لەگەڵماندا هاتە دەرەوە و هەر ئەوساش لێی پرسین ئەگەر بمانەوێت بچین و شۆکولادی لەگەڵدا بخۆینەوە. من دەمویست، بەڵام (کارین) وتی نا و ئیتر دەمی دا بەیەکدا و قرِوقەپی لێکرد. بە تەنیا لە سووچێکی جادەکەدا بە جێمان هێشت و بەناو جادە چۆڵ و بێدەنگەکانی ئەو یەکشەممەیەدا ڕێی خۆمان گرتە بەر، بەڵام کاتێک گەیشتینە بەر دەرگای ماڵی (کارین) لۆمەی ئەوەم کرد کە نەیویست شۆکولادەکەی لێ وەربگرێت. ئەویش بە تووڕەییەوە وتی: ئای کە گەوجی! خۆ دەزانیت کە نەدەبوو بۆ ئەوە ـ *ڕەنگە خۆشت بزانیت مەبەستم* چییە ـ لەگەڵیدا بچووینایە! و ئیتر خۆی کرد بە دەرگاکەدا و لەبەر چاوم ون بوو.

من تێنەگەیشتم مانای "ڕەنگە خۆشت بزانیت مەبەستم چییە" چییە و بەدەم ڕاڕایی و پرسەوە بەرەو ماڵ بوومەوە. بەڵام هەر ئەوەندەی پێم نایە ئەودیوی دەرگاکەوە، یەکسەر باسی ئەو پیاوەم بۆ (موددی) گێڕایەوە کە داوەتی شۆکولادی کردبووین و باسی (کارین)یش کە نەیویست لەبەر "ڕەنگە خۆشت بزانیت مەبەستم چییە" لەگەڵیدا بچین و لێشم پرسی: مانای "ڕەنگە خۆشت بزانیت مەبەستم چییە" چییە، بەڵام

(مــوددی) هەر ئەوەندەی وەڵام دامــەوە کــە (کــارین) باشی کـردووە کە نەیهـێشـتووە لـەگەڵـیدا بچین و ئەوەشی وت کـە کــەس نـابێت لـەخــۆوە و لەگــەڵ پیــاوێکی نامــۆ و نەنـاسـدا شـۆکـولاد بخـواتەوە و هـەروەها وتـی: ڕۆژگـارێکیش دێت کـە خۆت لە "ڕەنگە خۆش بزانیت مەبەستم چییە" تێدەگەیت.

هەروەهـا نەمـتـوانـی لەوەش تێــبگەم ئەو پیــاوەی لەســەر جادەیەک لێم هاتە پێشـەوە و لێی پرسیم کە ئاخۆ دەتوانێت نیگـارێکم بکێـشـێت، بۆ ڕێی پێ نـەدرا؛ لە کـاتێکدا پڕ بە دڵ حەزی دەکرد. کە لێی پرسیم من یەکسـەر وتم ئا دەمـەوێت و کــەچی (مــوددی) و (ی. پ. یێنسن) وتیــان نـا نایەوێت و بە شـێوەیەکی وا ناشـیرینیش وەڵامیان دایەوە کە من لەجیاتی ئەوان هەستم بە تەریقبوونەوە کرد. من پڕ بە دڵ حەزم دەکرد ڕێ بەو پیــاوە بدەم نیگـارێکم بکێـشـێت، لەبری ئەوەی بەرەو دەریاچەکـە دوای ئەوان بکەوم، بەڵام دڵـیشـم ختـورەی ئەوەی کرد کـە ڕەنگە پەیوەندی بە "ڕەنگە خۆشت بزانیت مـەبەسـتم چییـە"وە هەبێت. بەڵام کاتێکیش کە هیچ کەسێک نەیدەویست ماناکـەیم بۆ لێک بداتەوە، بۆ مـاوەیەکی دوورودرێژ لێم بوو بە مەتەڵێک کە پیاوی یەکـەم بۆ بۆی نەبوو شۆکـولادمان بداتێ و بۆ پیاوی دووەمیش بۆی نەبوو نیگـارێکم بکێشێت، هـەرچەندە پڕ بە دڵ حەزیشیان دەکرد!

**جەژنی کریستمس** نزیک بووەوە و لەگەڵ ئەویشدا سەماکردنی سالانەی قوتابخانەکەمان. تا ئەو کاتە توانیبووم خۆ لەم جۆرە بەزم و ڕەزمانە دەرباز بکەم. بەڵام، ئەمساڵ، (موودی) پێی وابوو کە دەبێت بچم و بەشداری بکەم.

وتم: ئارەزووم لێی نییە، بێجگە لەوەش نازانم سەما بکەم.

(موودی) پێی داگرت و وتی: پێویستە خۆت فێری ئەوە بکەیت سڵ لەوە نەکەیتەوە بەشداریی خۆشیی خەڵکانی دیکە بیت و بترسیت. ئەوەندەی پێوەندی بە سەماکردنیشەوە هەبێت، هەر هێندە لە لایەن کەسێکەوە بۆ سەما داوا بکرێیت، ئیتر خۆی دێت.

بە گرژومۆنییەوە وتم: بەڵام لە ماڵەوە و لەگەڵ تۆدا خۆشترە. بەم سەروفەساڵەشەوە کەس داوام لێ ناکات سەمای لەگەڵدا بکەم!

(موودی) وەڵامی دایەوە: ئەوەیان پێوەندی بە خۆتەوە هەیە. بەهەرحاڵ، کراسێکی جوانیشت بۆ ئامادە دەکەم.

کە ئێوارەی ئاهەنگ هات، خۆم لە کراسێکی ڕەقوتەقی خۆڵەمیشی، کە چەند خەتێکی سووری جەرگی تێدا بوو و هیچ بریقوباقێکی نەبوو، هەڵکێشا. وام هەست دەکرد کە لەنێو ماڵێکی لە کاغەزی ڕەقوتەق دروستکراودا دەجووڵێنمەوە. (موودی) پرچەکانمی کردەوە و تا ئەوەی قژم وەکوو شاڵێکی ئاڵتوونیی ئامالسپیی بریسکەدار بەسەر شان و ملمدا هاتە خوارەوە، بۆی شانە کردم.

ئەوجا بە لەخۆڕازیبوونێکەوە وتی: ئاوها، دەی لە ئاوێنەکەدا تەماشای خۆت بکە! دەبینیت کە وەکوو فریشتەیەکی بچکۆلانە دەنوێنیت؟

بە لاچاوێک تەماشای ئاوێنەکەم کرد و شتێکی بێ شێوەی بە ئاستەم دیارم بەرچاو کەوت.

(موددی)، بۆ قوتابخانە، لەگەڵمدا هات و بە درێژایی ڕێگاش بە خۆشییەوە هەر خەریکی قسەکردن بوو و منیش تاڵ و گرژ و بێدەنگ لەگەڵیدا ڕێم دەکرد. گفتم بە خۆم دا، هەر ئەوەندەی بگەینە جێ و بە جێم بهێڵێت، خۆم بدزمەوە. بەڵام وەک ئەوەی (موددی) بیرەکانمی خوێندبێتەوە، چونکە ئەو تا ئەو جێیەی کە جلی دەرەوەمان لێ دادەکەند لەگەڵمدا هات و یارمەتیشی دام پاڵتۆکەم لە بەرم دابکەنم. تا بە هەڵقەیەکیش لە هاوپۆلەکانم دەورە نەدرام، بۆ ماڵ نەگەڕایەوە.

کاتێکیش چووینە ناو هۆڵی ئاهەنگەکەوە، کە وەکوو تر هۆڵی وەرزشکردن بوو، ئۆرکێستراکە لەگەڵ تاقیکردنەوەی ژێی کەمانەکانیاندا خەریک بوون و ئەوەی پیانۆکەشی لێ دەدا، جار نا جارێک، دەستی بە دانەکانیدا دەهێنا و ئاوازێکی لێ هەڵدەستاند.

ئێمە، کچەکان، لە بەرێکی هۆڵەکەدا و کوڕانیش لە بەرەکەی تردا کۆ بووینەوە و لەنێوانیشماندا ئەرزی هۆڵەکە ئاوێنەئاسا، وەکوو دەریایەکی خاڵی، شەوقی دەدایەوە و بیرم کردەوە: خوایە کێ بێت بوێرێت بەسەریدا بڕوات! و، خۆم لە پشتی کچە گەورەکانەوە شاردەوە.

لە حەشارگەکەمەوە دەمبینی کە هەردوولا، کچان و کوڕان، بە شێوەیەکی جیاواز تر لەوەی هەن هەڵسوکەوت دەکەن. کچەکان بەدەم نیگەرانییەوە سەریان بەملا و ئەولا با دەدا و بەنازونووزەوە لەسەر نووکی پەنجەکانیان خۆیان بە دەوری خۆیاندا دەسووڕاندەوە و کوڕەکانیش لە دەوری یەکتر کۆ بووبوونەوە، بە گوێی یەکتریاندا دەچرپاند و بە ماناوە تەماشای لای کچەکانیان دەکرد.

تەنانەت مامۆستاکانیشمان بە شێوەیەکی نائاسایی، وەک

ئەوەی ئەوانیش چەند دانەیەکی وەکـــــوو ئێـــــمـــــە بن، هەڵسوکەوتیان دەکرد و من لەبری ئەوان شەرم دایدەگرتم و پێم وابوو کە فریویان داوین.

لەپڕێکدا چاوم لەسەر کوڕێک، کە لە (فرانک) دەچوو، گیرسایەوە؛ ئەو کوڕەی هەمیشە سەرنجی ڕادەکێشام و قەتیش بۆم هەڵنەکەوتبوو قسەی لەگەڵدا بکەم. خورپەیەک بە دڵمدا هات و بیرم کردەوە: ئەو چی دەکات لێرە، ئەو بۆ ئەوە نابێت لێرە بێت.

کوڕەکە، لەگەڵ کورگەلێکدا کە بەپەرۆشەوە سەرقاڵی گفتوگۆ بوون، ڕاوەستابوو؛ بەڵام خۆی قسەی نەدەکرد و بە وردی لە هۆڵەکەی دەڕوانی و منیش بیرم کردەوە: ئەویش، ئەگەرچی زۆریش قۆزە، بەڵام ئێرەی پێ خۆش نییە.

کە مۆسیقای سەما دەستی پێکرد، پشێوی کەوتە نێو کوڕەکانەوە. ئێمەی کچانیش هێندەی بۆمان کرا، لە کاتێکدا کوڕەکان هەموو پێکەوە و بە شالاوێکی هاوبەش لێمان هاتنە پێشەوە بۆ ئەوەی داوای سەماکردنمان لێ بکەن، کەمێک بەرەو دیوارەکەی پشتمان، پاشەوپاش، گەڕاینە دواوە. هێندەی نەبرد هۆڵەکە بە سەماکەران پڕ بووەوە. هەندێک هەر زۆر جوان سەمایان دەکرد، هەندێک لە قاچوقولی یەکتر هەڵدەنووتاندن و هەندێکی تریش بە شەرمەوە و لە جێی خۆیاندا چەقی بوون و نەیاندەزانی چۆنچۆنی هەڵسوکەت بکەن.

من تەنیا هەر ئەوەندەم لا گرنگ بوو، بزانم ئەو کوڕە قۆزە کێ بۆ سەماکردن بانگ دەکات. بەڵام ئەو، لێ گەڕا سەما لە دوای سەما تەواو بێت، بەبێ ئەوەی لە جێی خۆی بجووڵێت. ئیتر منیش بێ هیوا بووم. تۆ بڵێیت نەوێرێت داوا لە کەس بکات؟ پڕ بە دڵ حەزیشم دەکرد پەلی جوانترین کچی ئاهەنگەکە بگرێت و لەگەڵیدا بکەوێتە سەماکردن!

هێندەی نەبرد یەکێک لە مامۆستاکان لە کوڕەکە چووە پێشەوە، شتێکی پێ وت، دەستی گرت و وەکوو ئەوەی ڕێی لە سەماکەرەکان گرتبێت دووری خستەوە. بە نابەدڵییەوە بیرم لەوە کردووە کە بۆچی بەو شێوەیە مامەڵەی لەگەڵدا کرد.
هێندە بە بیرکردنەوە لەو کوڕەوە سەرقاڵ بووم کە بۆ یەک چاوترووکاندنیش، تا ئەو کاتەی کچێکی قەڵەو لە بەردەممدا قوت بووەوە و وتی: دەتەوێت سەمام لەگەڵدا بکەیت؟ بیرم بە لای ئەوەدا نەچووبوو کە چ ئازارێکم بە دەست ئەوەوە چەشتبوو کە کەس داوای سەماکردنی لێ نەکردبووم، ئەوجا لەو حاڵەتە سووکایەتیهێنەرەی کە تێی کەوتبووم تێگەیشتم. من ئەوەندە ناحەز و ناشیرین بووم، کە کوڕەکان شەرمیان دەکرد لەوەی بۆ سەماکردن بانگم بکەن!
ڕازی نەبووم بەوەی لەگەڵ کچەکەدا سەما بکەم، نەمویست سووکایەتییەکەی خۆمی لەگەڵدا بەش بکەم و ئەویش بەدەم بۆڵە و خورتەوە وتی: مامۆستاکەمان خۆی وتبووی ئەگەر کەس لە کوڕەکان بۆ سەماکردن بانگیان نەکردین، دەتوانین لەگەڵ یەکتردا سەما بکەین! بە گرژ و مۆنییەکەوە بە کچەکەدا هەڵشاخام: بەڵام من نا! ئەوجا ڕووم لێ وەرگێڕا و پشتم تێکرد.
بەردەوام بووم لەسەر سەرنجدانی کوڕەکە، هێشتا هیچ کچێکی بۆ سەما بانگ نەکردبوو و هێشتاش هیچ کوڕێک منی بۆ سەما داوا نەکردبوو.
بەڵام لە پڕێکدا دەنگ بەرز بووەوە کە ئیتر وەختی ئەوەیە کچەکان کوڕەکان بۆ سەماکردن داوا بکەن. منیش کتوپڕ بیرم کردەوە: بێگومان زۆرن ئەوانەی دەیانەوێت لەگەڵ ئەودا سەما بکەن. بەڵام هیچ کام لە کچەکان داوایان لێ نەکرد.

تێنەگەیشتم بۆ، ئاخر ئەو لە گشت کوڕەکانی تر جوانتر بوو!

کەمێک ڕاوەستام و کەوتمە بیرەبیرەی ئەوەوە کە ئاخۆ بوێرم داوای لێ بکەم سەمام لەگەڵدا بکات. بەڵام ئەی ئەگەر بیوتایە نا! ڕێک لەو کاتەدا مامۆستایەک بە سووکییەوە پاڵێکی پێوە نام و وتی: دەی، چیتە... ناوێریت کەس بانگ بکەیت!

لە کوڕەکە چوومە پێشەوە، نەموێرا تەماشای بکەم، کە داوام لێکرد و وتم: دەتەوێت لەگەڵ مندا سەما بکەیت؟ و دەستەکانم بۆ درێژ کرد، بەڵام کاتێک سەرم هەڵبڕی و تەماشای دەموچاویم کرد، ژان هەموو گیانی داگرتم. کوڕەکە نەختێک بۆ دواوە گەڕایەوە، بێ ئەوەی بزانێت چۆن دەستیم بداتێ، بێ ئەوەی دەستی بگاتە دەستم، دەستەکانی بۆ درێژ کردم. چاوی لە پێش خۆی بڕیبوو و لەوە دەچوو نەمبینێت. هەستێکی سەیر دایگرتم و نادڵنیا کەوتمە تەماشاکردنی دەوروبەری خۆم. ئەوجا مامۆستایەک لێم هاتە پێشەوە، بەتوندی قۆڵی گرتم و بە نزمییەکەوە وتی: چیت لێی دەوێت؟ نابینیت کوێرە؟

لەشم سارد داهات و بەپەلە بەرەو ئەو ژوورەی کە جلی دەرەوەمان لێ دادەکەند ڕامکرد، دەستم دایە پاڵتۆکەم و لە تەریقی و نەزانیی خۆمدا، بە ڕاکردن خۆم بە تاریکەییەکەی دەرەوەدا کرد.

**که سووریژه** وەکوو هەزاران دەنکەی بچکۆلەی سوور هەموو لەشمی داگرت، لە سەرەتادا (موددی) ترساند، بەڵام دوایی هەر ئەوەندەی بۆ مایەوە کە دڵخۆش بێت بەوەی بۆ ماوەی دوو هەفتە لە ماڵەوە لەگەڵیدا بمێنمەوە و نەچمەوە بۆ قوتابخانە و کە (ی. پ. یێنسن)یش هاتەوە ماڵەوە، بە شانازییەوە، کراسەکەی هەڵدامەوە بۆ ئەوەی گوڵە سوورەکانمی پێشان بدات، بەڵام ئەو بە تەنیا هەر سەیری ئەستێرەی مەمکۆڵە بچکۆلەکانی کردم کە وەکوو سەرتۆپەی دوو گردۆڵکەی بچکۆلەی سپی دەرپۆقیبوون و وتی: خۆ، کچەکەمان، هێندەی نەماوە ببێتە خانمێکی تەواو. بە شەرمەوە خۆم کردەوە بە ژێر کراسەکەمدا و نیگایەکی تووڕەی پڕ لە ڕق و کینەشم بۆ (موددی) ڕەوانە کرد. پێم وابوو کە لە خشتەی بردووم و بێجگە لەوەش نەمویست ئەوە ببیستم کە هێندەم نەماوە ببم بە خانمێکی تەواو. نەمویست گەورە بم. پێموابوو کە گەورەکان ناشیرین و نازانن بە شێوەیەکی دروست و بەجێ هەڵسوکەوت بکەن، کاتێک کە (موددی) مەتەڵی بێنوێژی بۆ لێک دامەوە و بەم وتەیە کۆتایی پێ هێنا: هێندە نابات تووش دەبیت و ئیتر تۆش گەورە دەبیت! دەستم بە گریان کرد. ئەو دڵنەوایی کردم: پێویست ناکات بگریت، چونکە هیچ ئێش و ئازارێکی نییە. من وتم: ئەوەم بەلاوە گرنگ نییە کە ئێش و ئازاری هەیە یان نا، بەڵام ناچارم کە گەورە ببم! ناچارم کە منیش وەک گشت گەورەکانی ترم لێ بێت؟ ئەو پێکەنی و وتی: دڵنیا بە کە گەورە بوویت، تۆش حەز لەوە دەکەیت کە گەورە بوویت، وەکوو وتیشم بە هیچ جۆرێک ئێش و ئازاری نییە.

بۆ ڕۆژی دوایی، لە قوتابخانە، تەنیا هەر بەوەوە سەرقاڵ

بووم کە هێندە ناخایەنێت منیش گەورە دەبم و هیچ هۆش و خەیاڵێکیشم لای وانەکان نەبوو. بەڵام لەپڕێکدا بە دەنگی مامۆستاکەم کە هاواری لێ کردم: کارلا! لەو خەون و خەیاڵاتانە بەئاگا هێنرامەوە و پێشم وا بوو تا (کار)ی لە دەم هاتە دەرەوە زۆری خایاند و پاشان وەک ئەوەی قامچییەک لە (لا) بسرەوێنیت بە خێرایی لە دەمی هاتە دەرەوە. ناوەکەم بەنێو ژوورەکەماندا گەڕا، بەر دیوارەکان کەوت و زرمەی لە پەڕەی گوێیەکانم هەڵساند. یەکەوڕاست هەڵسامە سەر پێ و ئەویش وتی: کارلا، دەتوانیت بەردەوام بیت، بەڵام من هیچم نەبوو لەسەری بەردەوام بم، هەر ئەوەندەم پێ کرا، گێژ و وێژ، لە جێیەکەی خۆم دابنیشمەوە. جارێکی تر هاواری لێ هەڵسا: کارلا! وەکوو چەقۆیەکم تێدا ڕابکەن وا بوو. دەستم بە گریان کرد و ڕەوانەی ماڵ کرامەوە. ئەمجارەش دیسان ناوی کارلا کاری خۆی لێ کردمەوە و لە کاتێکدا کە لەشم خەریک بوو بەخۆوە و گەورە دەبوو، بەتەواوی هەستم بە شوێنەونی و سەرگەردانی خۆم کرد و نەمدەزانی زیاتر ڕقم لە کامیان دەبێتەوە: ناوەکەم یان لەشم.

(موددی) وتی: ئیتر وەختە، گەورە بوویت و هەقە ئیتر پرچەکانت بکەیتەوە و پرچەکانمان وەکوو زەمبەلەکی سەعات لەسەر هەردوو گوێیەکانم پێچاوپێچ لوول دا و مەمکۆڵەکانیشمم، کە زۆر قووت و پڕچنگ بوون، لەنێو کراسەکەمدا توندمان کردن و (موددی)یش توندوتۆڵ پارچەقوماشێکی بە دەوری کەمەرمدا گێڕا و پاشان بەدەم پێکەنینەوە وتی: ئاوها، ئێستا لە ئینجانەیەکی ڕێک و زراڤ دەچیت! بەڵام من، بە هیچ جۆرێک، لە ئینجانەیەکی ڕێک و زراڤ نەدەچووم، بە پێچەوانەوە زۆر قەبە و زل بووم و هیچ

جێیەکیش لە لەشمدا نەبوو، بەبێ ئەوەی هەست بە تەریقی و شەرم بکەم، چاوەکانم بتوانن لەسەری پشوویەک بگرن. لەشی کوڕەکان وا زل نەدەبوون و سەرنجیان بۆ لای خۆیان ڕانەدەکێشا و ئێرەییم بە سنگە تەخت و پان و کەمەرە باریکەکانیان دەبرد، بەڵام دەنگیان گڕ و قووڵ دەبوو و هەندێک جاریش وەکوو ئەوەی بشکێن و وردوخاش بن وا بوون. هەروەها ئیتر کوڕەکان نەیاندەویست لەگەڵ ئێمەدا یاری بکەن و کۆمەڵ کۆمەڵ لەنێو گۆڕەپانی قوتابخانەدا دەوەستان و قاچیان لێ بڵاو دەکردەوە، ئێمەیان بە هێند نەدەگرت و هێندەش ترسناک دیار بوون کە نەمدەوێرا بە لایاندا تێپەڕم. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مامۆستا پیاوەکانمان لە هەمووان ترسناکتر بوون، چونکە هەندێ جار وەک ئەوەی لە پڕێکدا چاویان بە مەمکەکانم کەوتبێت هەورێکی سەیر و سەمەرە سەروسیمای دادەپۆشین و ئیتر بۆ من مەحاڵ بوو وەڵامی هیچ پرسیارێکیان بدەمەوە.

***زۆرجاران***، بە چاوی هەڵاوساوی شین و مۆرەوە بووەوە و ئەو دەوەنە دووکەڵە بۆگەنەی کە لە دەمییەوە دەهات، وەکوو بووکەسەماکەرەیەک قاچی تێکوپێک دەهاڵان و قیژەی دنیای پڕ دەکرد و، خۆی دەکردەوە بە ماڵدا. لەنێو دەرگای ئاوەڵای شەودا ڕادەوەستا، چاکەتی شلوشێواو و، بە پانتۆڵەکەیدا ڕشابووەوە، ڕشانەوەیەک کە وا دەهاتە پێش چاو کە هەم لە ناوەوەوە و هەمیش لە دەرەوە ڕشێنرابێتەوە و دەستەکانیشی وەکوو باڵندەی گۆشتخۆری چاوچنۆک بە دوای نێچێرێکدا دەگەڕان تا شاڵاوی بۆ بەرن و بیگرن. لەو کاتانەدا خۆم بەقەدەر (هیچ) لە ژێر سەرچەفەکەمدا بچووک دەکردەوە و خۆم وا پێشان دەدا کە هێندە بە قووڵی نووستووم کە هەرگیز وا نەنووستووم، بەڵام بەدەم ئاگایییەکی وەهاوە دەنووستم کە گوێیەکانی قووت دەکردمەوە و چاوەکانیشمی بەدەم ترس و لەرزەوە هەڵدەدایە سەر قەراغی سەرچەفەکە. بەڵام نیگای ئەو لەسەر (موددی) دەنیشتەوە، کە چەندین سەعات لە جێی خۆیدا دانیشتبوو و خەریکی چنینی گۆرەوییەکانی بوو و چرای ئێوارەش بە دەوری سەرە چەماوەکەیدا تیشکەکانی بڵاو کردبووەوە و هەر کە هەستیشی بە بۆگەنەکەی دەکرد هێندەی تر سەری بەرەو کونی گۆرەوییەکە دەچەماندەوە و سەعاتیش وەکوو گیانەوەرێکی قرتەقرتکەری کەللەڕەق لەسەر چرکەچرک و لێدانی خۆی بەردەوام بوو. ئەو لە جێیەکەی خۆی ڕادەوەستا و وەک ئەوەی سەرکەوتنێکی بە دەست هێنابێت، چاوی لە جێگاکەی منەوە بۆ سەر پشتە چەماوەکەی ئەو دەگواستەوە و دەیبینی کە چۆن ترس و لەرز تا دێت سەری پێ نەوی و نەویتر دەکات، دەیبینی کە چۆن منیش لەودیو سەرچەفەکەوە خۆم حەشار دەدا و تا دەهات

نادیارتر دەبووم، ئەوسا خۆی دەکرد بە ژوورەکەدا و بە دەنگە گڕەکەی هەورەگرمەئاسا دەیشیراند بەسەرماندا: خواردن! تۆش تەمەڵ و تەوەزەل وەرە و پێڵاوەکانم لە پێ داکەنە! (موددی) بە پەلە خۆی بە موبەقەکەدا دەکرد و منیش بە خێرایی تیرێک لە جێگاکەم دەردەپەڕیم و لە کاتێکدا لەناو لانکەکورسییەکەیدا پان بووبووەوە، لە بەردەمیدا دەهاتمە سەر چۆک و لە پانتۆڵە نیوەکراوەکەیەوە هەستم بە بۆنی میز، هالاوی بۆگەنی دەمی و بۆنی ئارەقەی نێو جزمە ترشاوەکانی دەکرد. ئەو دەینەڕاند: دەی خێراکە! و کاتێکیش دەمویست مەمکۆڵە قووت و بچکۆلەکانم، کە لە کراسەکەمەوە سەریان دەردەهێنا، بشارمەوە پێکەنینێکی ناخۆش سەروسەکوتی دادەگرت و قەڵەمێکی بەرەو درزی نێوانیان بەر دەدایەوە. کاتێکیش کە جزمەکانیم لە پێی دادەکەند و نەعلەکانم بۆ دەهێنایە پێشەوە، ئیتر دەمویست خۆم بۆ ناو جێگاکەم بدزمەوە، کەچی ئەو نەڕەی لێ هەڵدەستایەوە: ناڕۆیت، تا خواردنەکەم لێ نەبێتەوە دەبێت لەگەڵما بمێنیتەوە! ئەگەر (موددی) لەو کاتەدا بە دەنگە ترساوەکەی بەرپەرچی بدایەتەوە: بەڵام درەنگە، سەعات یەکی شەوە و ئەو منداڵە دەبێت بنووێت! بە سەریدا دەیقیژاند: تۆ دەمت داخە! و ئیتر، بەدەم بێدەنگی و قڕوقەپلێکردنەوە، دەکەوتەوە هەڵقوڕاندنی خواردنەکەی.

بەدەم لەرزەوە لەسەر کورسییەک دادەنیشتم و لە چاوە سوورەکانی ئەو و دەمی (موددی)م دەڕوانی، کە لەوە بوو ئێستا نا دەمێکی تر بەدەم گریەوزارییەوە وردوخاش بێت، بەڵام لەپڕێکدا ئەو سەروسیمای دەگۆڕا و دەستی دەکرد بە دەستهێنان بە دەست و ڕوومەتی (موددی)دا و دەیوت:

ئەوەندەش ترسناک نیم! هەموو پێداویستییەکتان بۆ ئامادە ناکەم؟ و ئەوجا ڕووی لە من دەکرد و دەنگی دەگۆڕدرا و پێی دەوتم: چەند ڕۆژێک لەمەوبەر کتێبێکم بۆ نەکڕیت، هیچ سوپاست کردم؟ بە لەرزلەرزەوە بەرەو لای ڕۆیشتم و بەڵام کاتێک دەستم بۆ درێژ کرد تا سوپاسی بکەم، کێشای بە دەستمدا و وتی: یەڵڵا، برۆ پاڵ کەوە! وەک ئەوەی لە دەستی ڕزگار بووبم، بەرەو جێگاکەم ڕامکرد، بەڵام لەنێو ئارامیی جێگاکەشمەوە دەمبیست کە هاواری لە (موددی) دەکرد: کاغەزەکان بهێنە پێشەوە! دەشمزانی ئەگەر (موددی) زاتی ئەوەی بکردایە لێی بباتەوە، ئیتر باقیی شەوەکەمان لێ دەبوو بە دۆزەخ و منیش بە دەستی گرموڵەکراوەوە لە (موددی) دەپاڕامەوە یارییەکەی پێ بدۆڕێنێت.

پاش دەمێکی دوورودرێژی بێدەنگی، گوێم لە هەڵسانی دەبوو و بە دەنگێکی لەخۆڕازییەوە دەیوت: با ئێمەش بڕۆین بنووین. هەر ئەوساش دەمزانی کە (موددی) یارییەکەی پێ دۆڕاندووە، بەڵام ئاساییش و ئارامیی شەوەکەی بۆ بردوینەتەوە.

***نیـوەگـریاو و بـەدەم پێکەنینەوە***، لە کـاتێکدا کـە لەسـەر ڕنوەبەفـرەکـە پاڵ کـەوتبـووم و (هێنری)ش لەسـەرم پاڵ کەوتبوو، قیژاندم بەسەریدا: دە، وازم لێ بێنە! واز بێنە! بەڵام ئەو دەموچاوی لە بەفر هەڵسووم و کەوتە شتنی سەروچاوم. وازم لێ بێنە! بەڵام ئەو بە نووکـەشـەقـێک جـانتـای قـوتابخـانەکـەی فـڕێ دایە ئەولاوە و هەردوو ئەژنـۆی لەسـەر سنگم گیرکرد و بە بەفر دەموچاوی شـتم و پێکەوە دەستمان بە پێکەنین کـرد و بەدەم پەلەقـاژێی خـۆ لـە دەسـتی یەکـتـر دەربازکردنەوە، ئەو قژی ڕاکێشام و پرچەکانم کرانەوە، بەڵام کە (مـۆنا) هات، دەمودەست، هەستایە سەر پێ و (مـۆنا)ش لێم هاتە پێـشـەوە و وتی: ئەوە پێت دەڵێم، ئەگـەر لەگـەڵ (هێنری)دا دەسـتی پێ بکەیت، هەردوو چاوت دەردەهێنم. منیش بە سەرسووڕمانەوە وتم: ئێمە هەر شەڕەتۆپەڵ دەکەین و هیچی تر. بەدەم هەڵگرتنەوەی جـانتـاکـەیەوە، وتی: خـۆت بێگوناه پێـشـان مـەدە و بەفـرەکـەش، لەو جـێـیـەدا من و (هێنری) پاڵ کەوتبووین قوڵ بووبوو.

(مـۆنا) جارێک بەدەم پێکەنینـەوە وتی: چیم دەدەیتێ ئەگـەر پێت بڵـێم کـوڕان چی لەگـەڵ کـچـاندا دەکـەن؟ پێم وت: بیـست گوڵەباخی باخچەکەمت دەدەمێ، ئەگەر پێم بڵێیت کوڕان چی لەگـەڵ کـچـاندا دەکـەن. بەڵام (مـۆنا) گـوڵەباخی نەویست. ئەو شـۆکولادی دەویست و منیش پارەم نەبوو شـۆکولادی پێ بکڕم. ئەوجا بەدەم سەماکردنەوە بە جێی هێشتم و وتی: کەواتە پێت ناڵێم کوڕان چی لەگەڵ کچاندا دەکەن.

***زۆرجاران*** کە بەدەم خەیالاتەوە (ئـ)ێیەک دەکێشم و کاتێکیش لەسەر کاغەزەکەی بەردەمم دیار دەبێت، بیر لە (ئێللی) دەکەمەوە و کاتێکیش کە بیر لە (ئێللی) دەکەمەوە گوێم لە دەنگی پێکەنینە خۆشەکەی دەبێت. پێم وایە کە ئێرەیی بە پێکەنینەکەی ئەو دەبەم، چونکە خۆم هیچ پێکەنینێکم نییە. من، کەمێک دەم لار دەکەمەوە و نووزەیەکم لێ دەبێتەوە و هەموو مرۆڤێکی ئاقڵیش دەزانێت کە ئەوە پێکەنین نییە. پێکەنینی (ئێللی) دووررودرێژە، وەکوو مرواری دەبریسکێتەوە و بێشمار بە دەوروبەری خۆیدا بڵاوی دەکاتەوە، وەکوو کانیاوێکی ڕوون وایە و دڵۆپە سازگارەکانی زوو سەروچاوت دەگرنەوە.

بەڵام جارێک لە جارانیش هەبوو کە تەنانەت منیش توانیم تێیدا پێ بکەنم و ئەوجارە لەگەڵ دەستەخوشکەکانمدا چەندان جار لە قاقای پێکەنینمان دا و، بە جۆرێک پێ دەکەنین کە چاومان لەنێو چرچولۆچیی دەموچاوماندا ون دەبوو، وەکوو ئەوەی تووشی سکئێشە بووبین، بەدەم قاقای پێکەنینەوە خۆمان گرموڵە دەکرد، ڕانمان لە یەکتر گیرکردبوو و بە قوڵە شاد و خەنییەکانمان جانتاکانمان بە بەرزی بە هەوادا هەڵدەدا. ڕۆژان هەبوون کە هەر لە دەمەوبەیانەوە دەستمان بە پێکەنین دەکرد، بە بلووزە تازەکەی مامۆستاکەمان پێ دەکەنین، بە پرچەکەی کە بەدەم تووڕەبوونەوە دەکرایەوە، پێ دەکەنین کاتێک یەکێک بەر دەبووەوە، یان کە یەکێک شووشەیەک مرەکەب بە کراسە خاوێنەکەیدا دەڕژا. وەکوو مەیموون خۆم بە دێلانێیەکانەوە هەڵدەواسی و پێدەکەنین و بەدەم گەڕانەوەشەوە بۆ ماڵەوە لەسەر سووچی جادەکەدا کۆ دەبووینەوە و لەنێو دەنگی

جەرەسی توورەوترۆی پایسکیلەکان و هۆرنی ئۆتۆمۆبیل و سەروچاوی گرژومۆنی ئەو خەڵکەوە خۆمان لە بیر دەکرد و پێدەکەنین و خۆمان دەچەماندەوە. هەندێک جار گەورەکانیشمان فریو دەدا و لەگەڵماندا دەکەوتنە پێکەنین، بەڵام زۆربەی جاران هەر ئەوەندە بوو لچێکیان لێ هەڵدەقورتاندین، سەریان لێ بادەداین و بەدەم بۆڵەبۆڵ و خورتەخورتەوە لەسەر منداڵی باش پەروەردەنەکراو لێمان دوور دەکەوتنەوە.

هەندێکمان دەیوێرا لەوانی تر زیاتر بەدەم یاریی پێکەنینەوە پێی لێ هەڵبرێت و وا بە تەنیا لە پێکەنینیان دەدا کە دەنگی پێکەنینیان، ڕووت و قووت، لە هەوادا گیر دەبوو و دەکەوتە مەترسییەوە. من، لە کاتی گۆرانیوتنی ئایینیدا، بە تەنیا دەستم بە پێکەنین کرد و کردیانمە دەرەوە، لە کاتی ناولێنان و قبووڵکردنم لە کڵێسادا دامە قاقای پێکەنین و خۆم بە دەستی (نەرم)ی قەشەکە بە لێدان دا و تەنانەت لەو کاتەشدا نەمتوانی ڕێ لە پێکەنینەکەم بگرم. تا مامۆستاکەمان بەتەواوی شێتگیر بوو و دەستی بە گریان نەکرد، لە پێکەنینی خۆم نەکەوتم. ڕۆژێکیان کە لە قوتابخانەوە دەگەڕامەوە، هێندە زۆر و پڕ بە دڵ پێکەنیم هێندەی نەمابوو بەدەم پێکەنینی خۆمەوە نەخۆش بکەوم و ئاخرێکەی چیتر خۆم بۆ نەگیرا و هەر بەدەم پێکەنینەوە میزم بە خۆمدا کرد و پانتۆڵەکەم تەڕ بوو، بەڵام لەو کاتەدا تەریق بوومەوە و بەدەم دەنگدانەوەی پێکەنینی گاڵتەئامێزی ئەوانی دیکەوە لە گوێمدا بە دزییەوە خۆم بە ماڵدا کرد.

ئیتر لەوساوە لە پێکەنیندا هێندە ئازا و بوێر نەبووم، بەڵام پێم وایە کە ئاخرێکەی لەو کاتەوە پێکەنینم لە دەست دا کە

بەدەم ڕێورەسمی ناولێنان و وەرگرتنەوە لە کڵێساوە، دەم بە خەندە، ڕووم بۆ لای هاوڕێ هەرە خۆشەویستەکەم وەرگێڕا بۆ ئەوەی بۆی بسەلمێنم کە منیش ڕێک وەکوو ئەو خۆم لەو ڕێورەسمە هیچ و بێمانایە بەرزتر ڕادەگرم، کەچی لەبری ئەوەی ڕووبەڕووی خەندە و گاڵتەی ئەو ببمەوە، دەموچاوێکی لە فرمێسکدا نقووم بووم بینی کە ئەو ڕێورەسمە بەتەواوی داگیری کردبوو. ئیتر لەوساوە بوێریی خۆم بەئاگای هێنامەوە و ترساندمی و پێم وابوو لە شتێکدا بە هەڵەدا چووم.

***هاورێیەکانم***، هاوڕێیانی یاری و ئازاردان، بە هەڵپە و بە ڕاکردن بەرەو ڕووم هاتن و هاواریان لێکردم: "لەگەڵمان دێیت بچین سەیری مەسعەدەکە بکەین؟" مەسعەدەکە لەو خانووە تازەیەدایە کە تایبەت بۆ کاروباری کارگێڕیی هەندێک لە دامەزراوەکان دروست کراوە. بۆ ئەوەی سەرنجم ڕابکێشن و هاوکاتیش فەرمانێکم بەسەردا بدەن، وتیان: "لەگەڵمان وەرە، تا پێشانت بدەین مەسعەد چییە!

لێم پرسین: مەسعەد چییە؟

(کارڵ) سنگی دەرپەڕاند و وتی: تەنانەت نازانیت مەسعەدیش چییە؟ و ئەوجا هەموویان، ئەگەرچی خۆشیان سەعاتێک لەوبەر، بۆ یەکەم جار، چاویان بە مەسعەد کەوتبوو، بە خۆهەڵکێشانەوە دەستیان بە پێکەنین کرد.

(کارین)یش، بە خۆی و زانیارییە تازەکەیەوە و بە نازونووزێکەوە، دەستی پێکرد: مەسعەد بۆ سەرەوەی خانووەکە بەرزت دەکاتەوە، بەناو کونێکی گەورەدا دەچێتە سەرەوە و دێتە خوارەوە و چەندان ژووری بچکۆلە و لەسەریەک هەڵچنراوی هەیە. ژوورەکان لە پێشەوە ئاوەڵان و بەبێ وەستان بەرەو سەر و خوار دەبنەوە. ئەگەر بتەوێت سوار ببیت، دەبێت بە خێرایی خۆتی تێ فڕێ بدەیت و لە چوونەدەرەوەشدا بە هەمان شێوە!

منیش پرسیم: ئێ باشە پیاو بۆ دەبێت سواری مەسعەد بێت؟ پلیکانەی لێ نییە؟

یەکێکیان وتی: گەلحۆ! بێگومان پلیکانەی لێیە، بەڵام مەسعەد بۆ ئەوەیە لەبری پلیکانە بە کار بهێنرێت. ئەوانەش کە وەکوو تۆن و ناوێرن هیچ شتێک تاقی بکەنەوە، دەبێت پلیکانەکان بە کار بهێنن. بەڵام ئەوە قسەی تێدا نییە کە ئێمە مەسعەدەکە بە کار دەهێنین."

بە گومانێکەوە لێم پرسین: "قەت سواری بوون؟

کــارڵ وتی: نەء! بەڵام لە خــەیاڵ و بیــری ئەوەدا بووین چاوەڕێ بین تا تۆش دێیت. ئێستاش کاتە، با ڕاکەین!

بە دوودڵییەوە لێم پرسی: بەڵام چی دەبێت ئەگەر پیاو فریا نەکەوێت لە وەختدا باز بداتە دەرەوە؟

(لاش)، کە هەمیشە لە من زیاتر دەترسا، وتی: ئەوسا دەکەویتە بەری و دەفلیقێیتەوە! و لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو وتی: مەسعەدەکە تا سەربان هەڵدەکشێت و ئەگەر لە وەختدا فریا نەکەویت بێیتە دەرەوە دەکەویتە بەینەوە و دەتفلیقێنێتەوە!

بەڵام ــ ئیتر دەستم لە پرس و ڕاکانی خۆم بەردا و هیچیش لە مەسعەد تێنەگەیشتم، تەنیا شتێک کە لێی حاڵی بووم ئەوە بوو کە لێی بترسێم و نەمەوێت سواری ببم.

ئەوسا بەرەو مەسعەدەکە ڕاپێچیان کردم.

قسە هەر قسەی ئەوانیش دەرچوو: مەسعەدەکە بەناو کونێک لە خانووەکەدا بەرەو سەرەوە هەڵدەکشا و چەندان ژووری بچکۆلەش لەسەر یەکتر کەڵەکە کرابوون و بەتەواویش کرابوونەوە، وا پێدەچوو مەسعەدەکە دیواری لە دیوارەکانی خانووەکە قەرز کردبێت و بەردەوامیش ئەم کون خۆی دەدایە دەست ئەو کونی دیکە و بەو شێوەیە بەردەوام دەبوو.

یەکێکی لە خۆمان بەتەمەنترم بینی کە چووە ناو مەسعەدەکەوە و بەرەو سەرەوە لەناویدا ون بوو و منیش بە ترس و لەرزەوە بەوانی ترم وت: بەڵام بۆ کوێ دەچێت؟ چی بە سەر دێت؟ بێگومان فریای ئەوە ناکەوێت لێی بێتە دەرەوە!

بیرم کردەوە کە قەت ناوێرم بچمە ناویەوە و هاوکاتیش کە بینیم لەسەر پارچەتەختەیەک نووسرابوو قەدەغەیە منداڵان

سواری مەسعەدەکە ببن، هەستم بە لەشسووکی و دڵنەوایی کرد.
بەتەواوی لە بەرانبەریدا هەڵسڵەمیمەوە و وتم: نابینیت نووسراوە کە بۆ منداڵان قەدەغەیە سواری ببن؟
هەر ئەوساش هەموو پێکەوە دەستیان بە پێکەنین کرد و وتیان: ئێ خۆ تۆ لەوانە نیت گوێ بە قەدەغە و قەدەغەکراو بدەیت. ئەی نایەتەوە بیرت کە بەسەر سەهۆڵەکەدا، ئەگەرچی قەدەغەش بوو بەسەریدا بڕۆیت، ڕۆیشتیت؟
ئای لە من! هەر ئەوەندە بەس بوو بیـــرم بکەوتایەتەوە! تەنانەت بە بیـرلێکردنەوەشی لە جێی خۆمـدا ڕەق دەبووم. پێشتر کە بەسـەر سـەهۆڵدا ڕۆیشـتبووین، لەسـەر پارچە سـەهۆڵێک بەر بووبوومـەوە بۆ ناو ئاوەکـە و لـە دواچرکـەدا ڕزگار کرابووم و کاتێکیش هاتبوومەوە ماڵەوە لەبری ئەوەی بە ڕزگاربوونم شاد و خەنی بن، تێروپڕ دارکارییان کردبووم.
لەپڕێکدا وتم: من ئیتر دەڕۆمەوە! خۆ هەر نەبێت چاوم بە مەسعەدەکە کەوت!
(کـارڵ) وتی: شـتی وا نییـە! کـە پێکەوە هاتووین، هەر پێکەوەش دەگـەڕێینەوە! و ئەوجـا، بۆ ئەوەی لە دەسـتیـان دەرباز نەبم، بە هەموویان ئەڵقەیەکیان لە دەور بەستم.
(کـارین)، کە زۆر لـە من جوان و ژیکەڵەتر بوو و هەمـوویان خـۆشـیـان دەویست، بە پەرۆشـەوە، وتی: ئێسـتـا دەزانم چی دەکەین، گرەو دەکەین بزانین کێ یەکەم کەس دەبێت سوار بێت!
یەکسـەر دڵم خـەبەری دا. هەسـتم کرد کـە لە گرەوەکـەدا گـزی دەکـەن و من بە یـەکـەم کـەس هەڵدەبژێردرێم. هەرواش بوو، بە تەنیـا من، بە خـۆم و درێژترین دەنکەشـقـارتەوە لەنێو دەستمدا، مامەوە.
وتم: نامـەوێت! بەڵام بەوپـەڕی سـووکـایەتیپـێکردنەوە پێم

پێکەنین. بەدەم لووشکەلووشکەوە وتم: ئاخر ناوێرم! و لە هەمان کاتیشدا بینیم چۆن پیاوێک بە هێمنی خۆی بە مەسعەدەکەدا کرد. ڕووی لە (کارڵ) وەرگێڕا و پێی وت: تۆش سوار دەبیت؟ و لە دواچرکەشدا (کارڵ)ی لەگەڵ خۆیدا پەلکێش کرد و هەردووکیان بۆ سەرەوە بەرز بوونەوە.

پێڕاگەیشتم (کارڵ) ببینم چۆن زەرد هەڵگەڕابوو و لەو کاتەدا بیرم کردەوە: ڕەنگە چیتر نەیبینینەوە! بەڵام هێندەی نەبرد بە پلیکانەکاندا بەرەوخوار بووەوە و بە کەشخەیەکەوە وتی: خۆ بینیتان! هی ئەوە نییە لێی بترسیت!

بۆ تاقیکردنەوەی منیش ڕووی تێکردم و وتی: سوار بە، ترسنۆک!

بەڵام بە پەلە فریای وەڵامدانەوەی کەوتم: بۆ تۆ ئاسانە وا بڵێیت، بەڵام خۆ تۆ ئەو پیاوە یارمەتی دایت و ئازایەتیی خۆت نەبوو!

(کارڵ)یش وتی: تۆ لەسەر یارمەتی پەکت نەکەوتووە! و ئەوجا پاڵێکی پێوە نام و کەوتمە ناو مەسعەدەکەوە و، لە کاتێکدا کە ئەوانی دیکە تا توانایان تێدا بوو پێدەکەنین و هاواریان دەکرد: خۆت هەڵدە! بازدە! و لەو ژوورە بچکۆلەیەدا بەرەو سەرەوە بەرزی کردمەوە.

بەڵام من ئەوە نەبووم بوێرم باز بدەمە دەرەوە و هەر ئەوەندەم پێکرا لە پەلوپۆکەوتوو لە جێی خۆمدا ڕاوەستام و ئەویش بەرز و بەرزتری دەکردمەوە، ڕێک لەو کاتەشدا گوێم لێیان بوو بە دەنگێکی پڕ لە ترس و لەرزەوە هاواریان دەکرد: خۆت هەڵدە! بازدە تا بەتەواوی نەگەیشتوویتەتە سەری سەرەوە!

گوێم لە دەنگی گەورەیەکیش بوو هاواری دەکرد: بازدە بە

ملی شکاو و ئەستۆ و ڕانی وردت! بەڵام من نەمتوانی باز بدەمە دەرەوە و هەر ئەوەندەم پێکرا خۆم دا بەسەر ئەرزەکەیدا و بەدەم ترس و لەرزەوە لێی پاڵ کەوتم و هاوکاتیش گوێم لێیان بوو بە پلیکانەکاندا ڕایاندەکرد و یەکێک قیژاندی: مەسعەدەکە بوەستێنن!

لەڕاستیشدا مەسعەدەکە ڕاوەستا. دەستێکی تۆکمە و پتەویش پەلاماری دام و ڕایکشامە دەرەوە و بەدەم ڕاوەشاندنمەوە وتی: سەلکەسەگ! لەناو ئەو مەسعەدەدا چیت دەکرد؟ نازانیت قەدەغەیە منداڵ سواری بێت؟

منیش هەر ئەوەندەم پێکرا دەست بە لووشکەلووشک و گریان بکەم و ئیتر ئەویش بەزەیی پێمدا هاتەوە و بە ڕووخۆشییەوە لێی پرسیم لە کوێ دەژیم و ماڵمان لە کوێیە. زمانم چووبووە کلیلە، بەڵام هەرچۆنێک بوو ناونیشانەکەمانم پێ وت. ئەویش وتی: دەی لێرە بەند نەبیت و ڕاکە بۆ ماڵەوە. بەڵام من سەری نارەزاییم بۆ ڕاوەشاند و ئەویش لێی پرسیم: دەتەوێت لەگەڵتدا بێم؟ بەپەرۆشەوە سەری ڕەزامەندییم بۆ ڕاوەشاند و ئەویش دەستی گرتم و دەیویست بەرەو مەسعەدەکە، کە بەرەو خوارەوە دەڕۆیشت، پەلکێشم بکات. بەڵام من تا لە توانامدا بوو بەرەنگاریم کرد، ئەو دەستی بە پێکەنین کرد و وتی: دە کەواتە با بە پلیکانەکاندا بچینە خوارەوە!

ئەوجا پێکەوە بە پلیکانەکاندا چووینە خوارەوە و کاتێکیش گەیشتینە نهۆمی خواری خوارەوە، بینیم هاوڕێکانم لەو ناوە نەمابوون و بە جێیان هێشتبووم.

بەڵام، بە تەریقی و شەرمەوە، هەموو لەسەر سووچێکی ئەو جادەیەی لێی دەژیاین کۆ بووبوونەوە.

پیـاوەکـە تـا بەر دەروازەی خـانووەکـەی بردم و مـنیش تـا لە توانامـدا بوو بە ڕاکـردن بـە هـەر پێنج پلـیکانەی خـانـووەکـەدا خۆم گەیاندە بەردەرگای ماڵی خۆمان و خۆم بە ژووردا کرد.

پاشـان چەند سـەعـاتێک لە ترسـاندا، لە جێی خـۆم، ڕەق و گـرمـۆڵە بـووبووم و دوای ئەوەش، جـار لە دوای جـار، لەگـەڵ هـەر سـواربوونێکدا، ئەو یادوەرییەم لەنێو خۆمدا دەژیانەوە.

**شانزەساڵ و** *شانزە گوڵی سوور!*

بەدەم ئەوەوە کە چاوە شینەکانم پڕ بوون لە شانزە ساڵ و گشت ئەندامەکانی لەشیشم بە شانزە جار سێسەدوشەستوپێنج ڕۆژ گران بووبوون لە خەو هەڵسام.

(موددی) وتی: بیری لێ بکەرەوە، وا شانزە ساڵی تەمەنیشت پڕ کردەوە! و ئەوجا دەموچاوە شاد و سوورهەڵگەڕاوەکەی بەسەر جێگاکەمدا چەماندەوە و زەرفێکی بۆ درێژ کردم کە دەستی تەواو قورس کردم.

ئەو شانزە گوڵە سوورە بە دەمولێوی ئاونگاویی نیوەکراوەوە لەنێو گوڵدانێکی کەمەرباریکدا ڕووبەڕووم وەستان و شانزە ماچی سووریان بە ڕوودا هەڵدام.

کە زەرفەکەشم کردەوە، شانزە کرۆنی بە بریقوباق بەسەر سەرچەفەکەمدا تل بوونەوە. (موددی) دەستی بە پێکەنین کرد و وتی: دەتوانیت، بە کەیفی خۆت، چۆنت بوێت ئەو شانزە کرۆنە بە کار بهێنیت. خۆت ئیتر گەورەیت و دەزانیت چی دەکەیت.

بەدەم حەز و ئارەزوویەکی زۆرەوە دەستم بە لەشە شانزە ساڵییەکەمدا هێنا، کە بەو دەمودەستە مۆڵەتی گەورەبوون و ئەوەی پێدرابوو کە چۆن بیەوێت وا بکات و لەکاتێکدا کە بەدەم تاسە و ئارەزووەوە لە پەنجەرەی کراوەی ئەو بەیانییەم دەڕوانی، ئەو پەنجەرەیەی بە باڵە شووشەییەکانییەوە ئیشارەتی بۆ دەکردم، بیرم کردەوە: دەمەوێت لەم ژوورەوە بە خۆم و گشت خەمینییەکانمەوە بفڕمە دەرەوە و بە شادی و خەنیبوونێکی هەمیشەییەوە بگەڕێمەوە.

بەڵام هەر لەو کاتەدا (ی. پ. یێنسن) بە خۆی و پاکەتێکەوە خۆی بە ژووردا کرد. بە سەرسوورمانەوە تەماشایەکی ئەو

شانزە کرۆنەی کرد و وتی: دەی با وا بێت! ئاخۆ ئەو پارانە لە کوێوە هاتبن؟ و ئەوجا بە تەوسێکەوە سەیرێکی (موددی) کرد.
چەند کتێبێک لەناو پاکەتەکەدا بوون. (موددی) بە ترسەوە سەیری کتێبەکانی کرد و پاشان بە لۆمە و سەرزەنشتێکەوە ڕووی بە لای ئەودا وەرگێڕا. ئەویش بە هێمنییەوە وتی: هیچ ترسی ناوێت! پیاو شانزە ساڵان بێت، بەرگەی ئەوەش دەگرێت (هاڵ کەین) بخوێنێتەوە، بێجگە لەوەش ئیتر وەختە بۆ ئەو لەوە تێبگات گەورەبوون چییە. پاشان بەدەم پێکەنینەوە ژوورەکەی بە جێ هێشت و جارێکی تریش بە لاچاوێک تەماشای کرۆنەکانی کردەوە.
کەوتبوومە ناو بیر و خەیاڵاتی خۆمەوە. بۆ خۆمم دووبارە دەکردەوە: دەبزانە گەورەبوون مانای چییە! بەڵام نامەوێت گەورە بم! نامەوێت وەکوو دەستەخوشکەکانی (موددی)م لێ بێت!
(موددی) لە پرس و خەیاڵاتەکانمی دابڕیم: دەبێت هەمیشە هەوڵ بدەیت لەوە شادتر خۆت پێشان بدەیت، کە هەیت! پیاو کە بوو بە شانزە ساڵان، ئیتر هەموو ژیان لە بەردەمیدایە. هەر ئەوە بۆ خۆی دڵخۆشییەکی گەورەیە. ئەوجا وتی: هەستە و جلەکانت لە بەر بکە، تا میوانەکانت نەهاتوون! و لە خۆشیاندا وەکوو ئەوەی ئەو شانزە ساڵانی پڕ کردبێتەوە، بەدەم قنگبادانەوە، خۆی بە موبەقەکەدا کرد.
بەڵام هەموو میوانەکان دەستەخوشکانی (موددی) بوون، نەک هی من. هەندێکیان هێندە قەڵەو و زل بوون کە بە خۆیان و پیرۆزباییەکانیانەوە خۆیان بەسەردا دەدام و بە تەواوی لە ژێر لەشیاندا ون دەبووم و، منیش مەجبوور ناڕازی و خەمبار خۆم لێ دەکێشانەوە دواوە، تەنانەت بۆ چرکەیەکیش دەستبەرداری ئەوە نەبووم بە بیرمیدا بهێننەوە، کە ئەو ڕۆژە،

لەو کاتە و لە هەموو چرکەیەدا، شانزە سالانم پڕ کردووەتەوە!

شانزە مۆم لە کێکەکە چەقێنرابوون، (شانزە سالان)ێکیش بە پیتی گەورە لەسەر ئالایەک نووسرابوو و بەسەر کێکەکەوە بوو، وەکوو ئەوەی مژدەهێنی سەرکەوتنێک بێت، دەشەکایەوە. شـــانزە ســـاڵ، بەدەم هەمـــووانەوە بوو و نەدەبڕایەوە. بیـــر بکەرەوە، شانزە سالان بیت! ژنەکان بە خۆیان و سنگ و بەرۆکە توند جەڕێنراوەکانیانەوە هەناسەیان هەڵدەکێشا و چاویان پڕ بووبوو لەو خەونانەی مەلەیان دەکرد و دەمیشیان، وەکوو بەڕوو تێیاندا تەقیبێت، لە قسەکردن نەدەکەوت.

ژنێکیان، بەدەم هێنانی دەنکەشقارتەیەکەوە بە قەراخی شقارتەکەدا، دەنگی لێ بەرز کردەوە و وتی: ئەگەر ئێستە شانزە سالان دەبووم! ئەوسا هەر خۆم دەمزانی چیم دەکرد! و بەدەم حیلکەحیلکیشەوە شانێکی لە شانی ئەوەی تەنیشتی دا. ئەمە لە چاوی مندا هەر زۆر سەیر و سەمەرە دیار بوو.

بەلام ئیتر (موددی) بە خۆی و قاوەکەی دەستیەوە خۆی بە ژووردا کرد و ئەو قسەوباسەش ژیانێکی تری تێکەوتەوە و بەدەم قسە و قاوەخواردنەوەوە کێکەکەشیان خوارد.

من بچووکترین پارچەیم بەرکەوت و ئەمەش نابەدڵی کردم.

یەکێک لە ژنەکان کە چاوی بە کتێبەکان کەوت، هەڵیدایەوە و وتی: دەی دەی ئەمانەشت وەرگرتووە! و قسەڕەقانە ئەم پرسیارەی لێکردم: بەلام ئەی جارێ، نەختێک، زوو نییە بۆ ئەم شتانە! دەنگ لە (موددی)ەوە نەهات و منیش لەو بێدەنگتر و ئیتر ئەو بە پەلەپەل کەوتەوە سەر ئەوەی قاوەیان بۆ تێ بکاتەوە. کەسیش چیتر باسی کتێبەکانی نەهێنایەوە پێشەوە.

لە نێوەڕاستی ئەو داوەتی قاوەخواردنەوەیەدا، (ی. پ. یێنسن) خۆی بە مالدا کرد. من لە جێیەکەی خۆمدا ڕەق

بووم. بەڵام ژنەکان گورجتر و وەکوو ئەوەی هیچ شتێک نەبووبێت، لەسەر قسەوباسەکانیان بەردەوام بوون.
ئاوها! لێرە دانیشتوون و جەژنی شانزە ساڵەی لەدایکبوونی پیرۆز دەکەن! ئەمەی وت و بە شووشەبیرە سەوزەکەی دەستی زرمەیەکی لە مێزەکە هەڵسان و کووپە سپییەکانی لە جێی خۆیان بەرز کردەوە. بینیوتانە چەند دەوڵەمەند بووە؟ شانزە کرۆن! شانزە کرۆنی وەرگرتووە و هی واش هەیە هەرچی پێی بڵێیت پارە لە گیرفانیدا نییە! و هەر بەدەم ئەو قسەیەشەوە، کەوتە هەڵگێڕانەوە و پێشاندانی گیرفانە بەتاڵەکانی.
ژنەکان لەنێو خۆیاندا دەستیان کرد بە حیلکەحیلک. (موددی)ش پشێو و خەمبار دیار بوو. من بیرم کردەوە: پارەکان دەشارمەوە، تا دەستی پێیاندا ڕانەگات. ئەوەم بیر کەوتەوە کە چۆن ئەو سەعات و بازنە زێڕینەمی کە لە کاتی بە تەواوی قبووڵکردنم لە کڵێسادا بە دیاری وەرمگرتبوون، بە بارمتە دابوو و تا ئەو کاتەش لەبەر دەستکورتی و بێپارەیی توانای وەرگرتنەوەیانی نەبوو.
بۆ ئێوارەکەی کە چووم و ڕاکشام، ئەو زەرفەی کە شانزە کرۆنەکەی تێدا بوو، لە ژێر سەرینەکەمدا شاردمەوە.
بەدەم شەڕەدەمی (موددی) و (ی. پ. یێنسن)ەوە خەبەرم بووەوە.
(موددی) جەختی لەسەر ئەوە دەکرد: هیچ هەقێت نییە، وا بکەیت! ئەوە دیاریی جەژنی لەدایکبوونی ئەوە و ئاخر پاشان ئەو چی دەڵێت و چۆن بیرت لێ دەکاتەوە!
ئەو وەڵامی دایەوە: ئەو هەمـوو قسەیەی بۆ چییە! هەر دەمەوێت لێی قەرز بکەم و هیچی تر. من ئێستا پێویستم بە قوومێکی ترە.

(موددی) وتی: هیچ هەقێکت نییە. من ماوەیەکی دوورودرێژ خەریکی کۆکردنەوەیان بووم و ئەویش هەقی خۆیەتی دەیەوێت چی پێیان بکرێت، بیکرێت.

ئەوجا ئەو تووڕە بوو و قیژاندی: هەرچۆنێک بێت، پارە پارەی منە! لە گیرفانم دەرتهێناون و دزیوتن! هەرچییەک لەم ماڵەدایە هی منە! تێگەیشتیت! و بە توندی دەرگاکەی لە دوای خۆیەوە بەیەکدا دا.

زەرفەکەم لە ژێر سەرینەکەم دەرهێنا و خستمە سەر مێزەکەی تەنیشت جێگاکەم.

بۆ سبەینێ کە لە خەو هەڵستام، زەرفەکە لە جێی خۆی نەمابوو و شانزە گوڵە سوورەکەش بە خەمینییەوە لارەمل بووبوون و هیچ کەسێکیش چیتر گوێی بەوە نەدەدا کە من شانزە ساڵانم پڕ کردبووەوە.

***هاوینە و هەتاوە!***

بەیانیی ئەو یەکشەممەیە دەمە شینەئاسمانییەکەی کردبووەوە و تیشکی خۆریش بێپەروا و وەکوو ئەوەی بیەوێت بەر شەوارەم بخات، خۆی بە ژوورەکەمدا کرد و بە ڕووناکییەکەی درزێکی لە چاوە هێشتا خەواڵووەکانمدا، کە هێشتا تاریکیی شەو بەری نەدابوون، هەڵکەند.

سەعاتی دیوارەکە شەش جاران، بە نەرمییەکەوە، لێی دا.

زیاتر حەزم بەوە دەکرد لە ژێر لێفەکەمدا بمێنمەوە و ئەو ڕۆژە هاوینەییەم بە خەونەکانم بهۆنمەوە.

بەڵام وا پێدەچوو ڕووناکایی خۆر هاوارم لێ بکات: ئاخر هاوینە، هەتاوە و یەکشەممەشە! و ناچاری کردم لە جێگاکەم هەڵسم.

بەرەو پەنجەرەکە ڕۆیشتم و لەوێوە بەرەوخوار چاوم لە دۆڵی جادەکە بڕی. هەرچییەک دەیتوانی بڕوات و بجووڵێت، بەرەو هەمان ئاراستە، بە ئامانجی گەیشتن بە دەریا، تەوژمی بۆ دەرەوەی شار دەبرد.

وا پێدەچوو، ترامە بە خەڵک ئاخنراوەکان، بە دەنگە گڕەکانیانەوە، زەنگی *"بەرەو دەریا! بەرەو دەریا!"* لێ بدەن و ئەو پاسکیلسوارانەش کە بە خۆشیی هاوینەوە خۆیان ڕووت کردبووەوە، بەرەوپێش، جووت جووت و لە ڕیزی درێژ درێژدا، شنەیان بوو. سێبەری خۆریش لەسەر ڕانە ڕووتوقووتەکانیان سەمای دەکرد و وا پێدەچوو هەر لەو کاتەشدا خۆر لەنێو چاوەکانیاندا پێ بکەنێت. ئۆتۆمۆبیلەکان دەیاندا بەلای پاسکیلسوار و ترامەکاندا و هەندێکیان، وەکوو ئەو کاتانەی کە شەبقەکەت فڕێ دەدەیتە پشت ملت، سەریان هەڵدابووەوە. دەمتوانی ڕێک بەرەوخوار تەماشایان بکەم و بە خێراییش

تیشکێک لە بەختەوەریی ئەو گەشتیارانەی کە بۆ چوونە سەیران پەلەیان بوو و لە خۆشیاندا لە قسەوباس نەدەکەوت، لێی دام.
کە گەڕامەوە ژوورەکەشم، بیرم کردەوە، هاوینە، خۆرەتاو و یەکشەممەشە و سەعاتیش هێشتا حەوتی بەیانییە و هەموو ڕۆژەکەش، وەکوو ئەبەدییەتێکی درێژ درێژ، لە بەردەممدا ڕاکشاوە. هاوکاتیش کەوتمە پرس و ڕاوە: بەڵام چی لەم ئەبەدییەتە بکەم!
هەر لەبەر ئەوەی کەسێکم نییە لەگەڵیدا بە پاسکیل و بە جووتە بەرەو دەریا ببینەوە، یان کەسێک نییە یاریی هاوین و خۆر و یەکشەممەی لەگەڵدا بکەم، دەبێت یەکشەممەکەم لەو باخچە بچکۆلەیەدا کە شتمان تێدا دەچاند، بە سەر بەرم. ماندوو و لەشبەبار ئاوها بیرم کردەوە و بە نابەدڵیش ڕووم لەوێ نا.
باخچە بچکۆلەکەی ئێمە، هاوبەش، لەنێو کۆمەڵێک باخچەی تردا بوو و هەموو ئەوانەی لەوێ کۆ بووبوونەوە، نیوەڕووت و نزیک لە یەکتر خۆیان دابووە بەر تیشکی هەتاوی هاوین و ژنانیش، بێ باک، ڕووتوقووتیی خۆریان، کە ڕکەبەرکێی هەموو یاساکانی جوانی و قەشەنگی دەکرد، پۆشیبوو و دەیانقیژاند و بە دەنگە گڕ و یەکتر هاندەر و هاوینەییەکەیانەوە، هاواریان لە یەکتر دەکرد.
من، وەکوو هەمیشە، نەختێک بە شەرمەوە خۆم بەنێو دەروازەکەدا کرد و خۆم گەیاندە باخچە بچکۆلەکەمان. لەوێ هیچ جێگەیەک بۆ خەونێکی تێکنەدراو و دوور لەوان نەمابووەوە، چونکە ئەو پەرژینەی لە چاوی دراوسێیەکان بە دووری دەگرتین، وەکوو هەموو پەرژینەکانی دیکەی

دەوروبەری باخچە بچکۆلەکان، هەر تا ناوقەدم بەرز بوو. هەموو هەر چاویان لە یەکتر بوو و دەروازەی هیچ کام لە باخچەکانیش دانەدەخران و هەموو دەمانتوانی، یەکسەر و بێ هیچ ڕێگرێکیش، بۆ لای یەکتر بچین. گرامۆفۆنەکان، لە شاباشی هاوین و خۆر و ئەڤیندا، ئەو ناوەیان پڕ کردبوو لە هاوار و دەنگەدەنگ و، لە گشت لایەکەوە، بەسەر پەرژینەکانیشدا لەگەڵ یەکتردا شەڕەدەم و قسە دەکرا و خەڵکی ڕۆژنامەیان لەگەڵ یەکتردا دەگۆڕییەوە و شووشەبیرەیان بۆ یەکتر درێژ دەکرد و بە خۆشیی یەکترەوە نۆشیان دەکرد و، تا جارێکی تریش شەڕ و بەگژیەکترداچوون دەستی پێ دەکردەوە، بۆ ماوەیەک، تا دڵ حەز بکات، دۆست و هاوڕێی یەکتر بوون و بە خۆشییەوە بە شان و قۆڵی یەکتریاندا دەکێشا.

تا ڕۆژیش بەرەو ئێوارە هەڵدەکشا، شان و قۆڵی ڕووتی ژنانیش بە تیشکی هەتاو سوورتر هەڵدەگەڕان و چاوی پیاوانیش بە بیرەخواردنەوە قورستر دەبوون و بەرامەی گۆشت و ماسیی برژاویش لە کۆلیتی کراوەی باخچەکانەوە بەسەر گوڵ و دەوەنەکاندا، کە مرۆڤ بێ مەبەست و بە خۆشیی هاوینەوە پێی پێیاندا دەنا، دەهاتە دەر. لەو گڕەی نیوەڕۆی هاوینەدا، دەوربەری سەعات دوو، ڕۆژنامەکانی ئێواران دەگەیەنرانە جێ و بۆ ماوەیەک بێدەنگی و خامۆشی ئەو ناوەی دادەگرت و تەنیا دەنگی خشەخشی هەڵدانەوەی ڕۆژنامەکان و دەنگی بەریەکترکەوتنی شووشە و پەرداخی بیرە بەر گوێ دەکەوت، بەڵام پاشان هەموو، هەروەکوو ئەوەی ئیشارەتێکیان بۆ کرابێت، بە بۆن و بەرامەی قاوە کە ئاسمانی باخچەکانی دادەگرت، بە ئاگا دەهاتنەوە و لەگەڵ یەکتردا دەکەوتنەوە قسە و شەڕەدەم.

من حـەزم لەو ئێـوارەهاوینانـەی نێـو ئەو کـۆمـەڵە بـاخـچـەیە نەبوو، کە تێیاندا خواردنـەوەی خۆر و بیرەخـواردنەوە خەڵکی دەخـستـە نێو دنـیای غـەڵبەغـەڵب و هـاوار و دەنگەدەنگەوە، کـە تێیـاندا پێکەوەبوون و شـادی و خـەنیبوون بە ژیان بەدەم قـیژە و هـاوارەوە بە یەکتـریدا هەڵدەشـاخـان بۆ ئەوەی ئەمـیان باوەڕ بە ڕاسـتیی ئەوی دیکەیان بهێنێت. هەمـیشـە خـەمـینییـەکی قــووڵ دایدەگـرتم و، لـە چاوەنوارِیی نـەرمـونـیـانی بێـدەنگیی ئێوارەدا، خۆم بۆ تاریکترین سووچی باخچەکەمان پەلکێش دەکرد.

تا ئەو کاتەش کـە ڕووناکیی شینی ئامالبـۆری ئێوارە، وەک تەمــێک ئـاســمــانـی بـاخــچــەکــەی دادەگــرت و دەنگی ئەو مرۆڤانەش، کە هـاوین و خـۆر و یەکشـەممەیان دەپەرست، کپ و خــەفــە دەبوو و تیـشـکەکـانـی ئاویش لـە سـۆندەکـانـی ئەو ئێوارەیـەوە بە هـەوادا دەپرژێنران و ئاوڕشێنی بـاخـچەی مـیوە و گـوڵەکـانیـان دەکـرد و بەدەم ئاوڕشـێنەوە خـەونێکی تاریک دەکەوتە بن قەدەکانیان، تا ئەو کـاتە نەمدەتوانی بەبێ ئەوەی لێم تـێک بدرێت خــەونی ڕۆژی یەکــشــەممانی هـاوینـەی خـۆم ببینم.

**هێشتا** هەر بە بلیتی منداڵان سوار دەبیت؟ پشکنەری ترامەکە، بە گومانێکەوە، لێی پرسیم و چاوی بەرەو مەمکەکانم، کە پرچەکانم وەک دوو گوریسی کاڵ تێیان ئاڵا بوون، شۆڕ کردەوە.

بە شەرمەوە تەماشای ئەرزەکەم کرد، بەڵام پشکنەرەکە هەر زوو بڕیاری خۆی دا و لە بلیتی گەورەکانی بۆ لێکردمەوە.

بلیتەکەم وەرگرت و نیگەران و خەمگین بیرم کردەوە: هەر لەبەر ئەوەی بلیتی گەورەم بۆ بڕدراوە، ئیتر کاتی ئەوە هاتووە پرچەکانم ببڕم و قژم بە تەواوەتی بەر بدەمەوە.

چووم بۆ لای سەرتاش و ئەویش خۆشحاڵ دیار بوو کاتێک پرچەکانمی کردەوە. بە دەربڕینێکی خەونئامێز و پڕ لە ڕێز و حورمەتەوە، قورسایی قژمی، لەنێو دەستەکانیدا کێشا. پاشان هەر زوو گەڕایەوە سەر حاڵی خۆی و وتی: لە پێشدا دەبێت تەواو کورتی بکەینەوە و مقەستێکی گەورە و زبری هێنایە پێشەوە.

منیش چاوم نوقاند.

مقەستەکە بەنێو قژ پڕوچڕەکەمدا کەوتە خرمەخرم و کارکردن و قژم بە بێدەنگی، چنگ لە دوای چنگ، دەکەوتە سەر ئەرزەکە.

نەموێرا تەماشای ئاوێنەکە بکەم، بەڵام سەرتاشەکەم، بە خۆشحاڵییەوە، بە دەورمدا هەڵدەبەزییەوە و لە قسەوباسی خۆی نەدەکەوت. هەر لە خۆت دێت! ئەمەی وت و پاشان: هەر نەختێک چاککردنی ئەملا و ئەولای ماوە! و ئەوجا مقەستێکی بچکۆلەتری هێنایە پێشەوە و خێرا خێرا و بە پەلە لەسەر بڕینەکەی بەردەوام بوو. پاشان چەند هەنگاوێک چووە دواوە و مقەستەکەش لە هەوادا، بەبێ ئەوەی بەر قژم بکەوێت،

لەسەر بڕینی خۆی بەردەوام بوو. هەر بەو شێوەیەش بە خۆشییەوە لەسەر کارەکەی خۆی بەردەوام بوو، بەڵام من پێم وابوو کە لە جریوەی خەمباری مەلێک دەچێت.

ناچار بووم پرسیاری لێ بکەم کە ئاخۆ بەو زووانە لێ دەبێتەوە. ئەویش وتی: هەر ئێستە تەواو دەبم! و هەر لەگەڵ ئەو قسەیەشیدا دوا جریوەی بە هەواکەدا بەرەڵا کرد. تەماشای ئاوێنەکە بکە!

تەماشایەکم کرد و یەکسەر ڕووم وەرگێڕا. سەری ڕەزامەندیم بە ڕووی شاد و خەنیبووی سەرتاشەکەدا ڕاوەشاند و بە هەنگاوی درێژ بەسەر قژە کەوتووەکەمدا کە وەکوو فەرشێکی کاڵ، لەسەر ئەرزەکە کەوتبوو، هەنگاوم هەڵهێنا. بە پەلە بەرەو ماڵ بوومەوە، بۆ ئەوەی بە زووترین کات دەموچاوە ڕووتەکەم، قژە کورتبڕاوەکەم، بشارمەوە.

زۆری خایاند تا دەستەکانم وازیان لە گەڕان بە دوای پرچەکانمدا؛ خەونە لەدەستچووەکانمدا، هێنا.

دوای ئەوە و هەر لەگەڵ بڕینی پرچەکانمدا، دنیای گەورەکان، لە هەرجێیەک، بە ڕوومدا ئاوەڵا بوو، بەڵام بە هیچ جۆرێکیش، لەوە زیاتر کە نائاسایی ساردی و سەرما لە پشتملی دەدام، هەستم بە زیاتر گەورەبوونی خۆم نەکرد.

دەستەخوشکەکانم پێیان وا بوو کە ئیتر دەتوانن، بێ ئەوەی ناچار بن لە بەرانبەر سەروسیما منداڵانەکەمدا هەست بە شەرم بکەن، لەگەڵ خۆیاندا بمبەن بۆ جێی سەما و هەڵپەڕکێ.

بەڵام، بێجگە لە مۆسیقاکە، هیچ کەسێک داوای لێ نەکردم سەمای لەگەڵدا بکەم.

ئاه، چەندێ بە ئاواتی ئەوە بووم بە تەنیا، لەگەڵ مۆسیقاکەدا، سەما بکەم و لەشم بخەمە بەر دەستی تا لەگەڵ خۆیدا بەرزی بکاتەوە، داگیری بکات!

بەڵام نەمدەوێرا لە جێی خۆمدا بجووڵێم. هەر تەنیا ئەوەندەم لە دەست دەهات بە دەموچاوێکی وەک مانگ ڕەنگزەردەوە و، لەگەڵ باسوخواسەکانی ناخی خۆمدا، لە جێی خۆمدا بوەستم، ئەمەش لە کاتێکدا کە ئاوازی مۆسیقاکە بەوپەڕی گورجوگۆڵییەوە تیرەکانی خۆی دەگرتە لەشم، ئەو لەشەی لە سەما ترسابوو و سڵی لێ دەکردەوە.

من دەمبینی کە کچەکانی دیکە، بەوەی کە دەیانوێرا شاد و خۆشیی خۆیان پێشان بدەن و شانازی بە لەشە جوان و گەنجەکەیانەوە بکەن، لەوە دەچوو خۆیان داوای سەما لە خۆیان بکەن.

لە کوێوە ئەو ئازایەتییەیان بە دەست هێنابوو؟

من سەماکەرەکانم بە چاو هەڵدەلووشی. بە چاوی ڕێزەوە لەو کچە بوێر و گورجوگۆڵانە ورد دەبوومەوە و هاوکاتیش ئێرەییم پێ دەبردن کە دەیانوێرا هێندە بە بەرزی پێبکەنن و بێ سڵکردنەوە پشتملە کورتبڕاوەکانیان بەملا و ئەولا با بدەن و بجووڵێنن، سەریان هێندە بە شانازییەوە بە بەرزییەوە ڕابگرن، لەشیان کەوانەیی و بەو گورجوگۆڵییە ببزوێنن و دڵنیا و بە شانازییەوە وەکوو کەشتیی چارۆکەدار لە باوەشی ئەوانەی سەمایان لەگەڵدا دەکردن بێن و بچن، هەمووی ئەمانەش لە کاتێکدا کە جارێک بە لای ڕاستدا و جارێکی دیکە بە لای چەپدا دەیانڕوانی.

چۆن دەیانوێرا؟

ئەی چۆن زاتیان دەکرد، تەنانەت لە قووڵایی ئەو تاریکییەشدا کە دەوری سەماگاکەی تەنیبوو، لەسەر پێکەنینی خۆیان بەردەوام بن؟

***باران**! باران! باران!*

باران کـە وەکــوو کـۆمـەڵە تەلێکی بریسکەداری لە تەنیـشت یەکەوە ڕیزکراو دەڕژایە خـوارەوە. باران بەسـەر دەمـوچاودا، کـەمـێک سـارد. سـەروقژی ئـاڵسـۆکـاو، کە بەسـەر لاملدا لار دەبووەوە و وەکـوو چەپکەگـەڵایەکی ڕەش بـە شـانوملدا دەهـاتە خوارەوە.

بە ســواری پایسکیلـەوە، بەنێــو لێــزمــەی بـارانەکــەدا، دەخلیسکام و پایسکیلەکەم وەکوو پێڵاوی خلیسکێنە بەسـەر ئەو جـادە قیـرتاوکـراوانەدا دەخلیـسکا، کـە بارانەکـە پاک و خــاوێنـی کــردبوونـەوە. بەنێــو تـاریکیی ئـەو ڕێگـایەدا کـــە درەخـتـەکـانـی ئەمبـەر و ئەوبەری سـەریان لە یەکـتری گـیـر کـردبوو و ئاسـمــانێکیــان لە چڵــوچێـو بۆ دروست کــردبوو، دەخلیسکا.

درەختەکـان بە زمانەباران بە گوێی یەکتریدا دەیانچرپاند، مـاچی ڕوومـەتەگـەڵای یەکـتریان دەکـرد و بـارانـەزەنگی قـورس قورسیان دەچۆڕاندە خوارەوە.

باران لە دەمـدا، تامێکی شـیـرین و نـەرم. گوڵەباران لەسـەر کــراســەکــەم، کـــە هێندەی نـەدەبرد کــراسـی لە تـاریکـی هـەڵدەکـێـشـا و وەکـوو پـارچەپەڕۆیەکی لیـنج و تەڕ بە هـەمـوو لەشدا دەنووسا.

بەڵام من ئیتر ئەوەندەم باران بەسەردا باریبوو، بەس بێت. چاوم لە دەروازەیـەک دەگـێـڕا. بـەڵام دەبوو لە پێـشـدا بەسـەر پـایسکیلـەکــەمــــەوە ئـەو ڕێگـا دوورودرێـژە ببــــڕم کـــە بە درەختەکانی ئەمبەر و ئەوبەری تەنرابوو، پاشان دەبوو بەسەر پردێـک و مــەیدانێکی گــەورەدا بـەردەوام بم، بەر لـەوەی بەو جادەیە بگەم کە چەندان دەروازەی تێدا بوو.

ئەو ڕێگایەی درەختەکان ئەمبەر و ئەوبەریان گرتبوو، درێژ و پانوپۆڕ بوو، لە هیچ لایەکیەوە خانوو نەبوو و دوو چەم لە هەردوولاوە، وەکوو دوو پشتێنەی زیوین، دەوریان دابوو و دڵۆپەی بارانەکەش، بێبڕانەوە، تەختاییەکەی دەرزیئاژن دەکرد.
هێشتا هەر بەسەر پایسکیلەکەمەوە بووم و بارانەکەش لەشی ساردتر دەکردمەوە. گوڵەکانی چاوم ڕەق بووبوون. ئۆتۆمۆبیلەکان بە لامدا گیڤەیان دەکرد و تێدەپەڕین.
هێندەی نەمابوو بگەمە سەر پردەکە. زەنگی کەشتییەک بەرز بووەوە کە دەیویست بە ژێر پردەکەدا بپەڕێتەوە، بەڵام نەیدەتوانی ئەو ستوونە لەخۆباییەی کە چارۆکەکانی پێوە بەسترابوو لە ئاست تاقی پردەکەدا بچەمێنێتەوە. دەبوو پردەکە کەوانەیی بە ڕووی ئاسماندا خۆی بکاتەوە و ڕێی دەربازبوونی بۆ خۆش بکات.
هاتوچۆ لە جێی خۆیدا وەستا، ڕاوەستا و کەوتە نێو دنیای بیرکردنەوەوە.
پردەکە دەمی، بە تەواوی، داچەقاند. بارانیش بە هەڵپە و لێزمە داڕژایە ناو ئەو بۆشاییەوە و پڕی دەکردەوە.
کەشتییەکە بە شانازییەوە بەنێو دەمی کراوەی پردەکەدا ڕەت بوو، وەک ئەوەی سەرکەوتنێکی بە دەست هێنابێت، زەنگێکی دیکەی لێ بەرز بووەوە. پردەکەش دەمە داچەقاوەکەی خۆی داخستەوە.
هاتوچۆ لە بیرکردنەوەی خۆی کەوت.
جەڕەسی پایسکیل و هۆڕنی ئۆتۆمۆبیلەکان دەستیان بە بەگژاچوونەوەی یەکتر کرد تا هەریەکە و بۆ جاریکی دیکەش بەتەواوی جێورێی خۆی لەسەر ڕێگای لەجووڵەنەکەوتووی هاتوچۆدا دۆزییەوە.

هەر بە سواری پایسکیلەکەمەوە گەیشتمە مەیدانە گەورەکە و باران بەتەواوی ئەوێشی شۆردبووەوە و بڵاوەی بە خەڵک کردبوو. تەنیا چەند کۆترێک نەبێت، کە تا بەرسنگیان لەنێو بارانەکەدا تەڕ بووبوو و، لێرە و لەوێ، نادڵنیا بەنێو بارانەکەدا دەگەڕان و لەپڕێکدا لە شەقەی باڵیان دەدا، دەفڕین و، وەکوو ئەو دەستانەی بۆ ماڵئاوایی ڕادەوەشێنرێن، لە هەڵبەز و دابەزی خۆیان نەدەکەوتن.

دەستم بۆ لای ڕاستی شەقامەکە درێژ کرد و پێچم کردەوە. بارانەکە، دەمودەست، دەریاچەیەکی بچکۆلەی لەسەر لەپی دەستم دروست کرد. لە پایسکیلەکەم دابەزیم و خۆم کرد بە دەروازەیەکدا.

چیتر دەنگی بارانەکەدا لە گوێمدا نەدەزرنگایەوە.

نێو دەرگاکە تاریک و خامۆش بوو، بەڵام بینیم تارماییەکان دەجووڵانەوە. جگەرەکان دادەگیرسان و دەموچاوەکانیش دەگەشانەوە. جگەرە و دەموچاوی گەشاوەی پیاوان بوون، تەنیا هەر پیاوانی لێ بوو، کە بە خۆیان و گوڵەئاگرینەکانی نێو دەمیانەوە، لامسەلایی، تەماشایان دەکردم.

هەستم بە ترس و لەرزێک کرد و خۆم گەیاندە سووچێک و دانیشتم. دەمویست بۆ بەر بارانەکە بگەڕێمەوە! نێو ساردی و سەرمای بارانەکەم لەو بێدەنگییە ئاگرینەی پیاوەکان پێ خۆشتر بوو!

لەوەدا بووم بەرەو دەروازەکە هەنگاو هەڵهێنمەوە، بەڵام دەنگێکی نووساو بەر گوێم کەوت: سەیری ئەو بووکەبەبارانە بچکۆلەیە بکەن، خوا بۆی ناردووین! و دەستی بە پێکەنین کرد! پیاوێک لێم هاتە پێشەوە و منیش بە دوای یارمەتیدا

سەیرێکی دەوروبەرەکەی خۆمم کرد. بەڵام ئەوانی دیکە لەوە زیاتر کە لەسەر تەماشاکردنی خۆیان بەردەوام بوون، هیچ گوێیان پێ نەدا. ئێستا ئیتر پیاوەکە هێندە لێم هاتبووە پێشەوە، کە دەمتوانی هەست بە بۆنی بیرەکەی بکەم. دووبارەی کردەوە: بووکەبەبارانێ بچکۆلەکەم! و یەکسەریش دەستی بۆ درێژ کردم.

دەنگێکی گڕ هەڵیدایە: واز لەو منداڵە بهێنە!

ئەوەی لێم هاتبووە پێشەوە، خۆی بۆ چەماندمەوە و وتی: منداڵ! منداڵی چیتە! تەماشاکە هێندەی ژنێک دەبێت! و لەگەڵ قسەکەیدا دەستی بۆ درێژ کردمەوە و، منیش، ڕێک لەو کاتەدا کە بە پەلە لە دەروازەکەوە چوومە دەرەوە، هەستم بە زبریی دەستی کرد لەسەر ڕوومەتم.

خۆم هەڵدایە سەر پایسکیلەکەم و دەنگی بارانیش گەڕایەوە نێو گوێیەکانم.

باران! باران! باران!

ئەو بارانەی وەکوو تەلبەندێکی بریسکەداری بە لێزمە دەهاتە خوارەوە. ئەو بارانەی بە فێنکی بەسەر دەموچاومدا دەڕژا و سەروقژی دەئاڵۆسکاندم، بەسەر لاملمدا لار دەبووەوە و وەکوو چەپکەگەڵایەکی ڕەش بە شانوملدا دەهاتە خوارەوە.

دڵیش زیاتر بە ئاواتی دڵنیایی ساردوسڕی نێو بارانەکەوە بوو، نەک گەرموگوڕی نێو دەروازیەک!

***زۆرجاران***، بەبێ هیچ مەبەستێک، بەنێو ئەو مەیدانەدا کە ماسییان تێدا دەفرۆشت، بە سواری پایسکیلەوە ڕۆیشتبووم.
بەڵام بەیانییەک سەرسامییەک کسپەی لە دڵم هەڵساند: خۆ ژنە ماسیفرۆشەکەش، بێبەزەییانە وەکوو ئەو ژنەی کە قوماش دەبڕێت، سەری ماسییە زیندووەکان لێ دەکاتەوە.
لەگەڵ بەربوونەوەی سەری هەر ماسییەکیشدا، زیاتر دڵم تێکەڵ دەهات و ناڕەحەتتر دەبووم.
لە پایسکیلەکەم دابەزیم و بەدەم بیرکردنەوە و خەیاڵاتەوە لەگەڵ خۆمدا بەسەر مەیدانەکە کە بۆنی خوێنی لێ بەرز دەبووەوە ڕۆیشتم.
ماسی، مقەست، چەقۆ و پوولەکەی ماسی، لە دەوروبەرمدا، وەکوو برووسکەی زیوین، هەڵدەبەزینەوە.
ماسییەکان، لەنێو حەوزە بچکۆلەکانیاندا، لە یەکتر ئاڵا بوون و مەلەیان دەکرد.
پەنجەی دەستەکان، وەکوو ناوسکی هەڵواسراو کە خوێنیان لێوە دەتکایە خوارەوە، ڕادەوەشێنران.
مقەستە بە پەڵەخوێن سووربووەکان دەمیان کردبووەوە: سەری مردووی ماسییەکانیش بەدەم ئازارێکەوە کە تەنانەت نەشیاندەتوانی بقیژێنن بەر دەبوونەوە.
لە هەموو لایەکەوە، لە پشتمەوە، لە پێشمەوە، هەر هەمان دیمەنم دەبینی: پەنجەکان لەنێو حەوزەکاندا بە دوای ماسییەکدا دەگەڕان، ماسییەکە بۆ ماوەیەک لەنێو پەنجەکاندا خۆی ڕادەپسکاند، مقەستەکە دەیبڕی و سەری ماسییەکەش بەو دڵۆپەخوێنە قەتیسماوانەی نێو چاو و ئەملاولای دەمیەوە دەکەوتە سەر ئەرزەکە، چەقۆکە پوولەکەکانی لەشی زیوین و بێ سەری ماسییەکەی دادەهێنا، پوولەکەکان وەکوو ئاوی

ســـەرچاوەیەک بە هـەوادا پەرش و بـڵاو دەبوونـەوە. پاشـــان ماسییەکی تر و دوای ئەویش یەکێکی دیکە دەگیرا: درامایەک بوو کـە لەژێر بارانی مـاسـیگرە زیقـاوڵەکـاندا، لـەنێـو ژنە ماسیفرۆشـە دەمـهەراشەکاندا و لەنێو زرینگەی بەربوونەوەی پارەزیوینـەکاندا بۆ نێـو ئەو قـاپە کـاشـییانـەی لە بەردەم ژنە ماسیفرۆشەکاندا دانرابوون، خوێنی لێ دەتکایە خوارەوە.

لەســەر ئـەرزە بەردڕێژکـراوەکـەش فـەرشـێک لە ســەری خـوێناویی مـاسییەکـان، ناوسکە هەڵدڕاوەکانیـان و پەڕەکە بڕدراوەکـانیـان، کـە لـە باوەشـێنی بچکۆلە دەچوون، ڕاخرابوو.

پـەست و خـــەمگین ســـواری پایسکیلەکـــەم بوومـــەوە، مـەیدانەکـەم بە جێ هێـشت و پرس و ڕایەکانیشم لـە ئاست دۆزینەوەی کـتـوپڕی ئـەو دراما پـڕ لە زەبروزەنگە و نـابیـانیی درێژخایەنی خۆمدا، لە بڕانەوە نەدەهاتن.

***تاقیکردنەوە*** بە هەرەشە و پێ وەکوو پشکۆ داگیرساوەکانییەوە نزیک بووەوە. خۆم لە دۆزەخی گەرمای باخچەکەماندا بەند کرد و بێوچان لەگەڵ خوێندنەوەی وانەکانمدا خەریک بووم و تا دەهات زیاتریش بۆم دەردەکەوت کە هیچ، بە هیچ جۆرێک هیچ شتێک، نازانم. ئەو ڕۆژانە، گەرم، پرووکێنەر و پڕ لە نیگەرانی بوون. هەر لەبەر ئەوەش کە دەبوو لە دەرگای باخچەکەمانەوە هەنگاو بەرەو دنیای گەورەکان هەڵبهێنمەوە، ناوچەوانم دەئێشا، شان و مل و لەشم وەکوو ئاگر دەسووتان و دەستەکانیشم وەکوو قارچکی شێداریان لێهاتبوو، دڵڕەقانە ڕووبەڕووی (موددی) دەبوومەوە و پێیدا هەڵدەشاخام و ئەویش دەگریا، هەردووکمان دەگریاین و لەشیشم گوڵەئاگرییەنەی گەورە و سپی دایگرتبووەوە و تیشکی هەتاو سەراپای سووتاندبووم و منیش لەتاواندا بە نینۆکەکانم هەموو قۆڵ و باسکی خۆمم پڕ کردبوو لە خوێن، چونکە دەبوو لە تاقیکردنەوەدا سەرکەوتن بە دەست بهێنم و دەبوو پێشانی دایکی (موددی) بدەم کە هەڵگرتنەوەی منداڵی خانەی منداڵان بێ سەمەر نییە و ساڵەکان، هاوکێشەکان، ناوی پەپوولە و ناوی ڕووبارەکان لە مێشکمدا سەمایان دەکرد و گوڵەباخەکانیش پڕ بووبوون لە هەنگ و بە دەوریاندا دەسووڕانەوە و شووشەبیرەی نیوەخوراوەی (ی. پ. یێنسن)یش بە خۆیان و دەمە بۆگەنکردووەکانیانەوە لەسەر مێزەکە دانرابوون و (موددی)ش هەر خەریکی دڵدانەوەی من بوو و یەک لە دوای یەک شۆکۆلادی بۆ دەکولاندم، بەڵام خۆ پیاو لە ڕێی خواردنەوەی شۆکولادەوە، سەرکەوتنی لە تاقیکردنەوەکانیدا بە دەست نەدەهێنا! (موددی) لەگەڵمدا بۆ قوتابخانە هات و

تفی *(بەختیار)*ی بە دوادا ڕۆ کردم و گۆڕەپانی قوتابخانەش گۆڕدرابوو، گشت کونج و قوژبنێکی بەو قوتابییە ترساو و بێدەنگانە گیرابوو، کە وەختی تاقیکردنەوەیان هاتبوو. مامۆستاکانیش، یەک یەک و، وەکوو گورگی تەنیا بەسەر گۆڕەپانە زیخەڵانەکەدا دەهاتن و دەچوون و لە قوژبنێکدا (کارین) ڕاوەستابوو و دەگریا، لە کونجێکی تردا (دۆریس) ڕاوەستابوو و شانی پێدا کردبوو و خەریکی خۆهەڵکێشان بوو، بەڵام من نە دەمویست نیگەرانی و نە هیچ شادی و خۆشییەکیش لە چاوی ئەوانی دیکەدا بە دی بکەم، بە بێدەنگی بەسەر گۆڕەپانەکەدا هەنگاوم هەڵهێنا و پۆلەکەشمان هەمان پۆلە کەوناراکەی جاران نەبوو، کە مرۆڤ دەیتوانی بە قاقای پێکەنینێک داگیری بکات، کپ و خامۆشی باڵی بەسەر گشت ڕەحلەکاندا کێشابوو و بۆ ماوەی دوو هەفتەی ڕەبەقیش، هەموو ڕۆژێک، لە لای مێزە سەوزەکەوە لەگەڵ سێ دادوەرکەمدا، کە بەردەوام پرسیاریان بە سەرمدا دەباراند، دانیشتم و کاتێک وەکوو کەسێک کە بەدەم خەونەوە قسان دەکات، وەڵامی پرسیارەکانیانم دەدایەوە، زۆر باش بۆم دەچووە سەر و کە وەکوو بەچکەمەلێکیش بە دەنووک بەر دەبوومە پرسیارەکان خراپترین وەڵامم لە دەم بەر دەبووەوە. بیرم لەوەش دەکردەوە: بەڵام هەر ئەوەندە لە تاقیکردنەوەدا سەرکەوتن بە دەست نەهێنم، هەر ئەوەندە دەرنەچم، خۆم هەڵدەدەم و خۆم لە ئاوی دەریاچەی (ستۆرتەدام)دا دەخنکێنم!

بەڵام هێندەی نەبرد بە سەرکەوتوویی بە خۆم و پسووڵەی تاقیکردنەکەمەوە لە بەردەمی (موددی)دا قوت بوومەوە و (موددی)ش کەوتە دنیای بەختەوەریی خۆیەوە و هەست بە

شانازیکردن هەموو گیانی داگرتبوو و بەڵام من، من تەنیا ماندوو بووم هیچی دیکە، سەرسامیش بووم بەوەی کە هێندە هەستم بە خۆشیی ئەوە نەدەکرد کە سەرکەوتنم بە دەست هێنابوو.

***کە داد و سکاڵام*** لە دەست شــەوە ترسناکـەکـانم کـرد، بەوە هێمنیان کردمەوە، کە بە تەنیا خەونی ناخۆشن کە شەوەکانم لێ تێک دەدەن و هیچی تر و دەیانوت: کە شـووت کرد، شـەوە ترسناکەکانیشت کۆتاییان دێت!

بە سـەرسـامـیـیـەوە تەمـاشـای ئەو کـەسـەم کـرد کـە ئەو قـسـانەی لە دەم دەرچوون و لـە خـۆمم پرسـی: شـووکـردن چ پێوەندییەکی بە خەونی ناخۆشەوە هەیە!

شەوەکانم کە جاری جاران هـەوارێکی هێمن و ئارام بوون بۆ من، ئێستا ئیتر پڕ بووبوون لەو ترسانەی ئازاریان دەدام. تەنانەت بەر لەوەی بڕۆمە نێو جێگاکەشمەوە، دەترسام. بە وردی تەماشای ژێر جێگاکەمم و ژێر کورسییەکانم دەکرد، دۆڵاب و پشت پەردەکان دەگەڕام، لەبەر ئەوەی نەبا کەسێک، یان شتێک، خۆی لەنێویاندا شاردبێتەوە. پاشان ڕادەکشام و بێ جـــووڵە چاوەڕوانی خـــەونەکـــانم دەکـــرد. زۆریشی نەدەخـــایاند، تـا ترس دەهات و هـەمـوو لەشی دادەگـرم و لە پەلوپۆی دەخستم.

لە سـەرەتادا وا هەسـتم کـرد کـە بووبم بە دوو کـەس: یەکـەمـیـان ترسـاوەکـە و دووەمـیـشـیـان ئەوەی کـە هەوڵی ئارامکردنەوەی ترسـاوەکـەی دەدا، بەڵام هـەمـیـشـە هـەر ترسـاوەکـە دەیبـردەوە و بەتەواوی داگـیـری دەکـردم. هەر ئەوەندەت دەزانی ئەو دەموچاوانەم لێ دەردەکەوتن کە چاویان وەکـوو کـونی ڕەشی کلـپـەسـەندوو وا بوون و بە هـەڕەشـەوە بەرەو ڕووم دەهاتن، پاشان بۆ چاوتروکانێک لەبەر چاو ون دەبوون و نەدەمـان و دیسان لە لایەکی ترەوە دەردەکـەوتنەوە. تارماییە نەبینراوەکانیش سەر ئەرزەکەیان پڕ کردبوو. قۆڵم بۆ درێژ دەکران و دەیانویست دەستم تێوە بدەن.

بەو هیوایەی کە لە ترسی قورستر بکەم و زەحمەتتر بێت بۆی تا بتوانێت بمگرێت، خۆم لە ژێر سەرچەفەکەمدا گرمۆڵە دەکرد. ئەژنۆکانم لە سەرچەفەکەم توند دەکرد و سەر و ئەژنۆکانم بە دەستەکانم دەشاردەوە، بەڵام ترس هەر خۆی پێ دەگەیاندم. ئەندامەکانی لەشمی لە یەکتر جوێ دەکردنەوە، نینۆکەکانی لە پێستەکەم هەڵدەچەقاند، خۆی لەسەر سنگم توند دەکرد، بە شێوەیەک کە بە زەحمەت هەناسەم پێ دەدرا، نیگا دێوئاساکەی خۆی بەسەر نیگامدا دەدا و بەدەم پێکەنینەوە شەوەزەنگەکەی خۆی بە سەر و ڕوومدا دەدا. بە درێژایی شەو، بەو شێوەیە، بەردەوام دەبوو، ڕاوی دەنام، پێم پێدەکەنی، بەوپەڕی هێزەوە دەیبردم بە ناخدا و دیسان هەڵیدەگرتمەوە و بەرەو نەبوون فڕێی دەدام.

قیژاندم و بەڵام قیژەم لە دەم نەهاتە دەرەوە. لە جێگاکەم دەرپەڕیمە دەرەوە، بەڵام بە هیچ کوێیەک نەگەیشتم. چونکە کە ترس بۆ چاوترووکانێک دەستی لێ بەردەدام، ئەوەم بۆ دەردەکەوت کە هێشتا هەر لە جێگاکەمدا ڕاکشاوم و کەسیش گوێی لە هاوار و قیژەم نەبووە. هەموو لەشم دەنیشتە سەر ئارەقە، بەر لەوەش ترس پەلامارم بدات و داگیرم بکاتەوە، دەنگی سکاڵا کز و بێهێزەکەی خۆمم دەبیست. بەو شێوەیە ئەمشەوم بەو شەویان سپارد و بەرەنگاریان بوومەوە، کە بەیانییش دادەکەوت بە تەواوی بێهێز و سەراسیمە دەبووم.

پێیان وتم: باشترە بچیتە لای دۆکتۆر، ئەو دەتوانێت دەرمانێکی هێمنکەرەوەت بداتێ!

چوومە لای دۆکتۆر و باسی شەوەکانی خۆمم بۆ گێڕایەوە. دۆکتۆرەکەش زەردەخەنەیەکی ئارام و هێمن نیوەی ڕوومەتی داگرت و وتی: ئاوها... شەوەکانت هێندە ناخۆشن!

دەستـە گەورە و گـەرمـەکـانی دۆکتـۆرەکـە، کـاتێک دەسـتی خستبووە سـەر شانەکانم و بە چاوە وەک دەریا شینەکانیەوە لێی دەڕوانیم، تـەزوویەکی خـۆشـیـان بە لـەشـمـدا دەهێنا. شـاردنـەوەی ترسی شـەوانەم لـەنێو ڕۆبە سپییەکەی ئەودا و هەسـتکردن بە قـورسـایی دڵنیـاییکەرەوەی تەمـەنی ئەو کـە وەکوو لێفـەیەکی نەرمـونیـان بەسـەر خەون و خـەیاڵاتە نادڵنیا کچانەکەمدا درابوو، ئارامی و هێمنی بە لەشم دەگەیاند.

زەردەخـەنەی دۆکتۆرەکە ئەو ئەڵقانەی بە بیر دەهێنامـەوە کـە لەسـەر ئاوی ئارامی دەریـاچەیەک، دوای ئەوەی بـەردێکت تێ فـڕێ دابـوو، دروست دەبوون. بە پانتـایی دەسـتـە سپییەکانی هەردێکی پڕ لە دەماری شین و سەوز ڕاکشابوو. ڕەنگی قژ و سمێڵی، لە ڕەنگی قاوەیی تۆخی پاییز دەچوو.

بلوزەکەم داکەند. دۆکتۆرەکەش ئاسقییەی ژێرکراسـەکەی ترازاندم و نیگا دەریاییـەکەی بەسـەردا پرژاندم و، بۆ ئەوەی گوێ لە ترپەی دڵم بگرێت، ڕوومەتە زبرەکەی نا بـە سنگمەوە. مـەمکم وەکـوو بەچکەپشـیلەیەکی بچکۆلە بەسـەر گـوێیـدا کەوتبوو و ئەویش بە دەمە سوورەکەی گوێی دەگرت. دەوەنێک لە گەندەموو لەنێو گوێی دۆکتۆرەکەدا ڕوابوو.

وتی: بە قـووڵی هـەناسـە هەڵکێشـە! منیش هێندە بە قـووڵی هـەمـوو ئەوم بە هـەناسـەیەک هـەڵکێشـا، پشێووی دایگرت و بە پەلە وتی: هـەناسـە بدەرەوە! هـەناسـە بدەرەوە!

پاشـان ژێرکـراسـەکەی تا سـەر ناوکم داکێـشـا و هـەردوو دەستی لەسـەر سـەرینەکەی سکم دانا و پاڵی نا بە سکمـەوە، هـەستم کرد قورسـاییـەکی گـەرم هەمـوو ئـەندامـەکانی لەشی داگرتم. لێوەکـانم قـورس بوون و دەیانویست لە یەکـتر جـیا ببنەوە. بێدەنگییەک لەنێو ڕانەکانمدا کەوتە زەنگلێدان. بەڵام

دۆکتۆرەکە لەسەر پاڵپێوەنانی خۆی بەردەوام بوو، بێ ئەوەی کەمۆکەیەکیش پێشانی بدات، کە لەشم لەو کاتەدا چ هەستێکی هەیە. لەشم دەگۆڕدرا، جارنا گەرم دادەهات و جارجاریش سارد دەبووەوە، جارنا وەکوو ئەوەی کلووەبەفری سارد دایپۆشیبێت و جاروباریش وەک ئەوەی هەزاران پشکۆی کڵپەسەندووی لەسەر بێت گەرم دادەهات.

دۆکتۆرەکە وتی: لەوە زیاتر کە گەورە بوویت، هیچ کەموکووڕییەکی ترت نییە! دەبێت ئیتر خۆت لەسەر ئەوە ڕابهێنیت کە وەک ژنێک بژیت! بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەرمانێکی هێورکەرەوەت بۆ دەنووسم. ئەوجا ڕووی لەودیو کرد و ڕووی لێ وەرگێڕام.

نەمویرا لێی بپرسم مەبەستی لەوە چی بوو کە ئیتر لەمەودوا دەبێت وەکوو ژنێک بژیم. سەیری پشتە پانوپۆڕەکەیم کرد و بینیم چۆن نووسینێکی شین لە پاندانەکەوە ڕژایە سەر ڕەچەتەکەی بەردەمی. بە کاوەخۆ خۆم لە بەر کردەوە، لەپڕێکدا، بەبێ ئەوەی بزانم بۆ، خەمینی دایگرتم.

دۆکتۆرەکە، بەر لەوەی بڕۆم، وەکوو ئەوەی داوای شتێکم لێ بکات، خۆی بەسەردا چەماندمەوە. هەستم بە تەزوویەکی گەرم کرد کە هەموو لەشی داگرتم و، بە دەمی کراوەوە، سەیرم کرد. بەڵام لەو کاتەدا تەنیا زەردەخەنەیەک گرتی و پاشان، وەک ئەوەی پەشیمان بووبێتەوە، ڕووی لێ وەرگێڕام و منیش لەگەڵ قورسایی دەستەکانیدا لەسەر لەشم ڕووم لێ وەرگێڕا و بە جێم هێشت.

***خۆم لە دەستەخوشکەکانم*** و نێهنییەکانیان جیا کردەوە و وا بە بیرمدا هات کە: نا، کەواتە دەڕۆم و بە تەنیا خلیسکێنە دەکەم! بە پەلە خۆم گەیاندەوە ماڵەوە، پێڵاوی خلێسکێنەکانم کە وەکوو پۆڵا دەبریسکانەوە هەڵگرت و بەسەر شانی چەپمدا دا و لەگەڵ نهێنییە قەشەنگەکەی خۆمدا بەرەو ئەو جێیەی خلیسکێنەی لێ دەکرا ڕۆیشتم. هەر لە دوورەوە شنەی مۆسیقاکە بەرەو ڕووم هات و هەر ئەوەندە نەبوو دەست بداتە باڵم و، بەنێو ئەو ڕێگای ئێوارەیەدا کە ئەمبەر و ئەوبەری بە درەخت تەنرابوو و، لە گشت لایەکیشەوە ڕووناکی و تاریکی بەسەردا دەباری، هەڵمبگرێت.

هێندەی نەبرد بە خۆشییەوە بەسەر ئەو ئەرزە سەهۆڵینەدا کە وەکوو ئاوێنە دەدرەوشایەوە کەوتمە سەماکردن. مۆسیقاکە یەک لە دوای یەک ئەو (ڤاڵس)انەی لێ دەدا کە سەماکارانی دەهێنایە جۆش و خرۆش و منیش چەند جارێک، بەوپەڕی شادی و خۆشییەوە، بە دەوری ئەرزە سەهۆڵینەکەدا خولامەوە.

پاشان، لەگەڵ ئاوازەکەدا، جارێک لەسەرخۆ و جارێک خێراتر، کەوتمە سەماکردن. جارێک هەنگاوی کورت و جارنا هەنگاوی درێژم هەڵدەهێنایەوە، جارێک لەسەر ئەم قاچ و جارێکی دیکەش لەسەر ئەوی تریان خۆم بەرز دەکردەوە، بۆ پشتەوە و بەرەو پێشەوە دەڕۆیشتم و خۆم لەسەر نووکی پێ بەرز دەکردەوە و وەکوو زەمبەلێکێک بە دەوری خۆمدا دەسووڕامەوە.

ئاه، چ خۆشییەکم لەو سەما ئازاد و کێوییە نەدەبینی!

سەماکەرانی تر بە دەورمدا تیژڕۆ وەکوو با دەهاتن و دەچوون. هەندێکیان تەنیا بوون و بە لای یەکتر و بە دەوری

یەکــتــردا تێــدەپەڕین. هەندێکیش بەدەم قــســەکــردنــەوە لە تەنیشت یەکەوە خۆیان لەسەر سەهۆڵەکە دەخلیسکاند. بەڵام دڵدارەکان، دەستیان لە دەستی یەکتری ئاڵاندبوو، دەستی یەکــتـریان گــرتبــوو و ڕوومــەتیــان لە یەکــتــر دەخـشــاند و، خــەونەکــانی دواڕۆژیان کــردبووە چارۆکــە و بێــدەنگ بەرەو پێشەوە خۆیان دەخلیسکاند، بە ڕووی یەکتردا دەتریقانەوە، نیگایان دەگۆڕییەوە و لەپڕێکدا لە قاقای پێکەنینیان دەدا و بۆ ئەوەی زیاتر سەرنجی یەکتر ڕابکێشن سەریان بە ڕووی یەکتر دەچەماندەوە و پێکەوە خۆیان فڕێ دەدایە نێو گێژەنی ســـەمـــایەکی هاوبەشـــەوە. بەڵام دیســـان بۆ باوەشی خــەونەکــانیــان بەر دەبوونەوە و لەوێدا گــیــریان دەخــوارد، هێواشیان دەکردەوە و بەدەم باوەشکردنەوە بە یەکتردا بە هەنگاوی درێژ دەســتــیــان بە خــۆخلیــسکاندن دەکــردەوە، ڕوومــەتیــان لە یەکــتــر هەڵدەســوو و بە ڕووی یەکــتــرەوە پێدەکەنین و نیگایان دەگۆڕییەوە.

بەڵام من! من ئەو یارییەم دەکرد کە لەنێو هەموو بایەکاندا تێژڕۆترین بام!

یەک لە دوای یەک بە بایەکــانی تر: با تەنیــاکــان، ئەو بایانەی لەگــەڵ یەکــتــردا گــفــتــوگــۆیان بوو، با دڵدارەکــان، دەگەیشتمەوە، پێشم دەدان و دەمگرتن.

جارێک و دوو جار پێیان گەیشتمەوە و گــرتمنەوە و بۆ جاری سێیەمیش کە ئاوازە تایبەتەکەی (ڤالتیۆفێلس) بەرز بووەوە بە لای دوو دڵداردا تێــپــەڕ بووم، کــە پێکەوە لەگــەڵ ئاوازەکــەدا دەیانوتەوە: *"خــۆشم دەوێیت، خــۆشت دەوێم!"* و ئیــتــر لە بەردەوامــیی ئەواندا منیش ئەم ئاوازەم بۆ خــۆم دەوتەوە: *"بەڵام من کــەسم خــۆش ناوێت، من، من ئازادم و*

*کەسم خۆش ناوێت!*" و هەر بەدەم ئەوەشەوە لەسەر نووکی پێ نووشتامەوە و چەند جارێک، هەروەکوو ئەوەی بمەوێت جەخت لەسەر ئازادییە پڕ لە خۆشییەکەی خۆم بکەمەوە، بە دەوری خۆمدا خولامەوە.

هەر بە ڕاستیش هەستم بەوە دەکرد کە چۆن پەنجەگەورەکانم لەسەر کەمەرە بچکۆلە ئازادەکانی خۆیان ڕاکشابوون.

ئەوجا بە نەرمییەوە خۆم بۆ ڤالسەکە چەماندەوە و هەر لەگەڵ ڤالسەکەشدا بە خێرایی بەرزم کردەوە، هەنگاوی درێژم نا، هەنگاوی بەپەلەم نا، لە جێی خۆمدا ڕاوەستام، بە دەوری خۆمدا سووڕامەوە، ئەو دوو دڵدارەش کە "*خۆشم دەوێیت و خۆشت دەوێم!*" یان وت ڕوو بە ڕوو ڕاوەستان و یەکتریان ماچ کرد، بەڵام من هەر ئەوەندەم لە دەست هات بەدەم گۆرانیوتنەوە: "*من کەسم خۆش ناوێت، من ئازادم و کەسم خۆش ناوێت!*" بە لایاندا ڕەت بووم و هەر بەدەم ئەمەشەوە بەتەواوی باسکەکانم کردەوە و باوەشم بە هەوا فینکەکەدا کرد.

بەڵام لەپڕێکدا بایەکی تاریک لە تەنیشتمەوە ڕاوەستا. شەبقەکەی داگرت و لێی پرسیم کە ئاخۆ دەتوانێت یاریی بام لەگەڵدا بکات.

سەرم لێ ڕاوەشاند و و وتم: نا... نا... بەڵام هاوکاتیش چەند نیگایەکی فریودەرم تێ گرت و بەدەم خۆخولانەوە و وتنەوەی گۆرانییە ئازادەکەمەوە: "*بەڵام من کەسم خۆش ناوێت!*" بە ڕێ کەوتمەوە. بەڵام ئەو با تاریکە هەروا بە ئاسانی دەستی لێ هەڵنەگرتم، دوام کەوت و جارێکی دیکەش شەبقەکەی بەرز کردەوە و هەمان پرسیاری لێ کردمەوە.

دیسان وەڵامم دایەوە: نەخێر... نەخێر... و بەڵام دەستکێشە سوورەکەمم لێ بەربووەوە و بەپەلە خۆم بۆ چەماندەوە و هەڵمگرتەوە و لە شەرماندا دەموچاوم سوور هەڵگەڕا و من لەسەر خلیسکێنەی خۆم بەردەوام بووم و با تاریکەکەیش هەر بە دوامەوە بوو. چەند جارێک بە دەوری ئەرزە سەهۆڵینەکەدا لە شەقەی باڵم دایەوە و دوو دڵدارەکەش ئێستا ئیتر لەسەر کورسییەک دانیشتبوون و یەکتریان لە ئامێز گرتبوو: *"خۆشم دەوێیت، خۆشت دەوێم!"* یان دەچڕی.

بەڵام دیار بوو کە شتێک لەو خۆ لە دەست دەربازکردنە فریودەرەمدا لە من ڕووی دابوو، چونکە پێم وا بوو چیتر ئەوەندە خۆش و شادیهێنەر نەبوو بە *"کەسم خۆش ناوێت!"* وەڵام بدەمەوە. ـ لەشیشم چیتر هەستی بە ئازادی و شادی نەدەکرد و کاتێکیش کە با تاریکەکە، سەرلەنوێ، شەبقەکەی بەرز کردەوە و بە چاوەکانی لێی پرسیم، هەر ئەوەندەم پێکرا بە نەرمییەکەوە بە سەر وەڵامی بدەمەوە و ئەوجا ڕووم لێ وەرگێڕا. ئەویش ئیتر ناچار دەستی هەڵگرت و چیتر دوام نەکەوتەوە.

کاتێکیش کە دوو دڵدارەکە بۆ جارێکی دیکەش بە خۆیان و گۆرانییەکەیانەوە: *"خۆشم دەوێیت، خۆشت دەوێم!"* بە لامدا تێپەڕینەوە، هەستم بە خەمگینی و لەشبەباریی خۆم کرد و ئیتر ئەرزە سەهۆڵینەکەم بە جێ هێشت.

بەڵام بەر لەوەی بڕۆم، بینیم با تاریکەکە دەستی کردبوو بە ڕاونانی بایەکی تازە و منیش لە خۆمم پرسی: بۆ نەمدەتوانی کەسێکم خۆش بووێت!

***یەک ــ دوو ــ سێ، یەک ــ دوو ــ سێ***، تۆنەکانی ڤاڵسەکە لە پیانۆ کۆن و شکستۆکەکەوە دادەبارین. مامۆستای سەماکردنیش، بەدەم بە دەوری خۆدا سووڕانەوەوە، هاواری دەکرد: "یەک ــ دوو ــ سێ و یەک ــ دوو ــ سێ." پیانۆلێدەرەکەش سەری بەرز دەکردەوە، دایدەنەواندەوە و بەرزی دەکردەوە و دایدەنەوانەوە و دەستە سپییەکانی وەکوو باڵندە بەسەر ددانەکانی پیانۆکەوە بازیان دەدا، دەهاتن و دەچوون. مامۆستاکە فەرمانی پێداین: یەک ــ دوو ــ سێ و یەک ــ دوو ــ سێ. با پیاوەکان داوای سەماکردن لە ژنەکان بکەن و پیانۆلێدەریش "یەک ــ دوو ــ سێ و یەک ــ دوو ــ سێ." دەستی بە ددانەکانی پیانۆکەدا کێشایەوە.

لە خۆم پرسی: ئاخۆ کەس داوا دەکات سەمای لەگەڵدا بکەم؟ و کە کۆڕی تاریکی کوڕەکانیش بڵاوەی لێ کرد و یەکە یەکە وەکوو سێبەری سامناک بڵاو بوونەوە، خۆم بۆ ناو گەرمە دڵنیاکەی کۆڕی کچان کێشایەوە. یەک ــ دوو ــ سێ، یەک ــ دوو ــ سێ و دەنگە قووڵ و گڕەکان داوایان کرد: دەتوانین سەما بکەین! دەتوانین پێکەوە سەما بکەین! یەک ــ دوو ــ سێ، یەک ــ دوو ــ سێ و دەنگی هەندێ لە کچەکان بە ساردییەوە وەڵامیان دایەوە: بۆ نا! و هەندێکی تریش بە شەرمەوە: ئا، سوپاس! و هەندێکی دیکەش هەبوون وەڵامیان نەدەدایەوە. بیرم کردەوە: منیش، وەکوو ئەوان، وەڵام نادەمەوە و بەڵام، یەک ــ دوو ــ سێ، یەک ــ دوو ــ سێ و مامۆستاکەمان ئارامی لەبەر هەڵگیرا بوو و بە پەنجەکانی ئاماژەی بۆ دەکردین: خێراکەن! خێراکەن! با دەست پێ بکەین!

بۆ ماوەیەک دەوروبەرم، ساردوسڕ و چۆڵوهۆڵ بوو. ئەی ئەگەر کەس داوام لێ نەکات سەمای لەگەڵدا بکەم؟ دەمویست بە ناخی ئەرزەکەدا ڕۆ بچم و جووڵەیەکی منداڵانەم کرد و پەنجەم خستە دەممەوە، بەڵام یەک ـ دوو ـ سێ، یەک ـ دوو ـ سێ و سێبەرێکی ڕەش بە سەرمدا چەماوەیەوە و وتی: دەتوانین سەما بکەین؟ بەبێ ئەوەی بوێرم تەماشای بکەم، سەری ڕەزامەندیم بۆ لەقاند و ئەویش لەگەڵ خۆیدا بۆ سەر ئەرزەکە بە کێشی کردم و هەموو گیانیشی بۆنی ئارەق و دووکەڵی جگەرەی لێ دەهات.

یەک ـ دوو ـ سێ، یەک ـ دوو ـ سێ و بیرم کردەوە: ئێستا ئیتر، هەر چۆنێک بوو، منیش یەکێکم لە بەشدارانی سەماکە و مامۆستاکەشمان ئیتر دڵنیا بوو کە سەما دەستی پێکردووە و پیانۆلێدەرەکەش بە تەواوی کەوتە ئاوازلێدان و لەشی جارێک بە لای ڕاستدا و جارێک بە لای چەپدا دەهات و دەچوو و پێچەکەکانی پیانۆکەش یەک ـ دوو ـ سێ، یەک ـ دوو ـ سێ ئەو ناوەی هێنابووە لەرزین و سەماکەرانیش، جووت جووت و بە دوودڵییەوە، کەوتبوونە سەما و هەڵپەڕکێ.

من قەت پێشتر سەمام نەکردبوو، قەتیش کوڕێک دەستی لە کەمەرم گیر نەکردبوو، من شەرمم دەکرد، بەڵام ئەوەی کە سەمای لەگەڵدا دەکردم هەر بە دوای خۆیدا کێشی دەکردم و یەک ـ دوو ـ سێ، یەک ـ دوو ـ سێ، هەستم کرد وەکوو بەردێک قورس و سەنگین ناتوانم لە جێی خۆم ببزوێم و پێم وا بوو کە ئەو بەر پێی گرتووم. ئایا قاچم بخەمە نێو قاچییەوە، یان نا؟ بەڵام نەموێرا ئەم پرسیارەی لێ بکەم و ڕانەکانیشم لەوە دەترسان بەر ڕانی بکەون.

یەک ــ دوو ــ سێ، یەک ــ دوو ــ سێ و ئەو هەر سەمای دەکرد و بەبێ موبالاتەوە سەیری سەرەوەی دەکرد و منیش هەستم کرد وەکوو بووکەدارینەیەک بە دەستییەوە و لەنێو باوەشیدا دێم و دەچم. ئاوازەیەک لە مامۆستاکەمان بەرز بووەوە: یەک ــ دوو ــ سێ، یەک ــ دوو ــ سێ! و دەستی یەکێک لە سەماکەرەکانی گرت و بۆ ماوەیەک پێکەوە کەوتنە سەماکردن و سوورانەوە بە دەوری یەکتردا. ئاه، خۆزگە بەوەی کە دەیتوانی ئاوا بسوورێتەوە و سەما بکات!

یەکێک لە دەستەخوشکەکانم پێی وتبووم: بوێریت سەما بکەیت، دەوێریت ئەوەی تریش بکەیت و بینیبووشم چۆنچۆنی بە دەوری خۆیدا سەمای دەکرد و سەمای دەکرد و پیاوانیش لە دەوری کۆ بووبوونەوە و چەپڵەیان بۆ لێ دەدا و یەک ــ دوو ــ سێ، یەک ــ دوو ــ سێ و ڕوومەتەکانی وەکوو پشکۆ داگیرسابوون و کراسەکەشی وەکوو چەترێک لە دەوری قاچە ڕێک و جوانەکانی کرابووەوە، یەک ــ دوو ــ سێ، یەک ــ دوو ــ سێ و ئا بەو جۆرەی ئەو خۆت فێری سەما بکە و دڵنیاش بە لەوەی کە دەوێریت ئەوی تریان بکەیت. منیش ئەوی تریان بوو کە حەزم دەکرد، بوێرم بیکەم. یەک ــ دوو ــ سێ، یەک ــ دوو ــ سێ و مامۆستاکەمان هاواری کرد: پێ بە پێیدا مەنێ! توند دەستی بگرە و وا مەزانە دەتسووتێت! و ئەو کوڕەی لەگەڵمدا سەمای دەکرد وا بەرەو خۆی ڕاپێچی کردم، سەرسمێکم دا و شەرمم لە سوورهەڵگەڕانی دەموچاوی خۆم کردەوە و دەستەکانیشم تەڕ بووبوون و ئارەقەیەکی تەنکیش لەسەر لێومەوە خوێی تکانە نێو دەممەوە و یەک ــ دوو ــ سێ، یەک ــ دوو ــ سێ و پیانۆلێدەر و ئەوەش کە لەگەڵ مندا سەمای دەکرد، ماندووبوونیان لە بیر چووبووەوە.

بوێرە بژیت، پێ بکەنە، سەما بکە و یەک ـ دوو ـ سێ، یەک ـ دوو ـ سێ! پێ بکەنە، سەما بکە و بوێرە بژیت و مامۆستاکەمان دەنگی بەرز کردەوە: ئێستاش بە پێچەوانەوە سەما بکەن، بەڵام قاچمان تێکەڵوپێکەڵ بوو و منیش پارسەنگم تێک چوو. مامۆستاکەشمان وتی: بتوانیت بە لای ڕاستدا سەما بکەیت، دەشتوانیت بە لای چەپدا سەما بکەیت و دەموچاویشی بە تەواوی سوور هەڵگەڕابوو.

بوێریت سەما بکەیت، دەشوێریت بژیت و یەک ـ دوو ـ سێ، یەک ـ دوو ـ سێ و ئیتر ترسم شکا و کەوتمە سەیرکردنی ئەو کوڕەی سەمام لەگەڵدا دەکرد، دەموچاوی پڕ بوو لە زیبکە و بەوپەڕی گوێپێنەدانیشەوە تەماشای دەکرد و ئیتر وا پێی بە پەنجەکانمدا دا، کە لە تاواندا چاوم پڕ بوون لە فرمێسک و یەک ـ دوو ـ سێ، یەک ـ دوو ـ سێ و بوێریت سەما بکەیت، دەشوێریت بژیت.

مامۆستاکەمان پێی ڕاگەیاندین: دەست بەر مەدەن، تا خۆم پێتان دەڵێم! هێشتا کاتمان ماوە و فریای چەند سووڕێکی تریش دەکەوین و یەک ـ دوو ـ سێ، یەک ـ دوو ـ سێ! من بە تەواوی لە پەلوپۆ کەوتبووم، بەڵام بوێریت سەما بکەیت دەشوێریت بژیت و خوێن لە لەشمدا کەوتبووە گەڕ و قاچەکانیشم وەکوو داری تەپڵلێدان دەهاتن و دەچوون یەک ـ دوو ـ سێ، یەک ـ دوو ـ سێ و بوێریت سەما بکەیت، دەشوێر... ـ مامۆستاکەمان هاواری لێ کردین: بوەستن! وانەکەمان تەواو بوو! پیانۆکەش لە لێدان کەوت.

بۆماڵەوە ڕۆیشتمەوە و یەک ـ دوو ـ سێ، یەک ـ دوو ـ سێ! و بوێریت سەما بکەیت، دەشوێریت بژیت!

لە ناخـمدا دەنگی دەدایەوە، بەڵام لە سـەرسـووچێکدا چەند دانەیەک لە سەماکەرەکان وەستابوون و پێ دەکەنین و وتیان: تەماشـاکـەن! و دڵنیـا بن لەوەی کـە تـا ئێـسـتـا تـامی ئەوەی تریانی نەچێشووە ــ

نەمویست گوێم لە بەردەوامیی قسەکانیان بێت، چونکە بوێریت سەما بکەیت، دەشوێریت بژیت!

***هێندە خۆم بە ئازاد و دڵشاد دەزانی، نەبێتەوە***. جادەکە تا حەز بکەیت، درێژ و پانوبەرین بوو. دڵشادییەکەم تا دڵ پێی خۆش بێت، گەورە و سەربەست. لە لای چەپمەوە، شیشەبەندێکی بەرز هەبوو و سەوزاییەکی ڕەشباو باسکەکانی لێوە درێژ کردبوو و لەو بەریشەوە ئۆتۆمۆبیلەکان تێدەپەڕین.

بەڵام سواری ئۆتۆمۆبیل نەدەبووم! پێویستیشم بەوە نەبوو لە باسکە ڕەشەکانی سەوزاییەکە بترسێم! هێندە هەستم بە تیژڕۆیی و ئازایەتیی خۆم دەکرد، نەبێتەوە. شەقام کەوتبووە بەر پێم و ئەوسەری نادیار و نەبڕاوەی لە هیچ کوێیەکەوە دیار نەبوو. لە پشتیشمەوە هەروەها. دەمتوانی بفڕم و لەنێو ئەو دوو جەمسەرە نادیار و نەبڕاوەیەی شەقامەکەدا سەما بکەم. دەمتوانی ئەو قالۆنچە ڕەشەی بە ژێر دڵخۆشییە بێسنوورەکەمدا دەڕۆیشت، بە پێیەکانم پانوپلیش بکەمەوە، بەڵام پڕ بە دڵ حەزم بەوە دەکرد هەموو شتێک بژی و بە وریاییەوە بە لایدا تێپەڕیم.

بەڵام ڕێک لەو کاتەدا لە سووچێکەوە کە سێبەر دایگرتبوو، هاوارێک هات: سەیرکە، چ مەمکێکی پێوەیە! ئۆهـ! خوای بێ خوایان، خۆ مەمکەکانمم لە بیر کردبوو! و ئیتر شەقام هێندە تەنگەبەر بووەوە، هێندە تەنگەبەر بووەوە، کە ئاواتم بەوە دەخواست ئۆتۆمۆبیلەکان چۆنیان بووێت لەگەڵ خۆیاندا بمبەن، لەشم هێندە گەورە و هێندە قورس بوو، مەمکەکانیشم هێندە گەورە و ڕووت و بەرەڵا و شەرمەندە، کە دەمتوانی قالۆنچەی جوانی و قەشەنگی لە ژێر پێیەکانمدا بفلیقێنمەوە. دەبوو بە هەموو قورسایی خۆمەوە، بڕۆمەوە بۆ ماڵەوە و لەشە زۆر قورس و گرانەکەم قوتار بکەم، ڕزگاری بکەم، بیشارمەوە و چاری مەمکە بێشەرمەکانیشم بکەم.

(ئێلێن) لێی پرسیم: بەڵام بۆ مەمکەکانت وا پان دەکەیتەوە؟ و بە سەرسوورِمانەوە سەیری ئەو پارچەقوماشەی کرد کە بە توندی لە دەوری سنگم، بە جۆرێک کە بە حاڵ هەناسەم بۆ دەدرا، گریێم دا. ئەو وتی: تۆ کە مەمکەکانت هێندە خرت و قوتن. بە ڕاستی ئێرەییت پێ دەبەم. نابێت خراپیان بکەیت. ئەگەرنا پیاوان حەزیان لێ ناکەن.

بە تووڕەییەوە لێم پرسی: ئاخر بۆ خاتری خوا! پیاوان هەقی مەمکی منیان چییە؟ ئەو پێکەنی: ئەو ڕۆژە دێت پیاوان مەمکەکانت ماچ دەکەن و تۆش حەزی لێ دەکەیت.

پیاوان مەمکەکانم ماچ دەکەن؟ نەمتوانی پرسیارەکەم بێنمە سەر زمان و هەر ئەوەندەم پێ کرا بە سەرسوورِمانەوە سەیری (ئێلێن) بکەم. زۆریش حەزم دەکرد لێی بپرسم کە ئاخۆ پیاوان مەمکەکانی ئەویان ماچ کردووە و ئەویش حەزی لێی بووە، بەڵام لەبری ئەوە بە هێواشی دەرگاکەم پێوە دا و ڕۆیشتمە ژوورەکەی خۆمەوە.

***باوەشی پێدا کردم و وتی:*** ئاه، کە نایابیت! و هێندە لە باوەشیدا هێشتمیەوە، کە لە ڕاستیشدا خەریک بوو باوەڕ بەوە بکەم، کە زۆر نایابم.

بەڵام چی لەم نایابییە بکەم؟ لە خۆم پرسی و دەستم بە گریان کرد بەسەر نایابییەکەمدا کە نەمدەزانی چی لێ بکەم و کەڵکی چی دەگرێت.

نا، دەستیان لێ مەدە! دەستیان لێ مەدە! بێدەنگ دەستەکانیم لابرد و لەبرییان، لێوەکانم پێشکەش کرد، کە پڕ بە دڵ دەمویست ماچیان بکات. بەڵام نەیدەویست لێوەکانم ماچ بکات، تەنیا دەیویست مەمکە ترساوەکانم بگرێت و لەنێو دەستەکانیدا بەندیان بکات، خۆم لە دەستەکانی ڕاپسکاند، دیسانەوە بەندی کردمەوە و سەری زمانی ئاخنییە ناو گوێ سەرسامەکانمەوە، دەستە برسییەکانیشی لە دەوری مەمکە ترساوەکانم خۆیان گرمۆڵە کرد، بەڵام نەیویست لە لێوە ئازاکانم بخواتەوە.

بە خاوخلیچکییەکی تاریکەوە هەموو لەشمی خستە ژێر ئارەزووییەکی قووڵەوە. هەر کە پڕیشکێکی بە جێیەکی لەشمەوە دەنا، بەجێی دەهێشت و، ترسناکتر، دەکەوتە داگیرسانی پڕیشکێکی تر و، زۆر گران بوو خۆ لەو هەموو پڕیشکە ترسنۆکانە بپارێزیت، کە نەیاندەوێرا گڕ بگرن. تەنیا دەمم، ئەو جێیەی لەشم کە بێباکانە دەیوێرا، ئەو نەیویست و دەستم بە گریان کرد. ئەوسا، بە توندی خۆی بەسەر ملمدا چەماندەوە و تا هاوارم لێ هەڵسا هەر گازی گرت، پاشان پێکەنی و وتی: وەرە با پێکەوە ئاوازێک لێ بدەین! لە تەنیشت پیانۆکەوە دانیشت و دەستی کرد بە لێدانی ئاوازێکی پیکادۆر و پەنجە درێژە باریکەکانیشی لەنێوان ددانە ڕەش و سپییەکانی پیانۆکەدا وەک ئاگری سپی سەمایان دەکرد،

پاشــان دەســتــەکــانمی بەرزکــردەوە و وتـی: دەی نـۆرەی تۆیە! منیش بەردەوام بووم و ئەویش وتـی: خێـراتر، خێراتر! و چەند جـارێک ئاوازەکـەمـان پێکەوە لێـدا، تا تەواو مـاندوو بووین و هێز و بڕسـتمان پێ نەما. ئەوسا ئەو بە پێکەنینەوە هەسـتا و دەرگـای پیـانۆکـەی بـەیەکدا دا و وتـی: ئاوازی پیـکادۆر ئاوها لێ دەدرێت، دڵنیاشم کە قەت لە بیرت ناچێتەوە.

***دەبێت هەر ئێستا ڕوو بدات***. دەبێت ڕوو بدات. هەموو ئەوانی تر ئەوەیان بە سەر هاتبوو. ئێستا ئیتر دەبوو بە سەر منیشدا بێت. دەمێک بوو شەقامەکان وەکوو ئێوارەڕووباری قووڵ و درێژیان لێ هاتبوو، ئەو ڕووبارانەی کە چاوەکانی من وەکوو گوڵەزەنبەقی ڕەش لەناویاندا مەلەیان دەکرد، مەلەیان دەکرد و پێیاندا دەگەڕان و هەر کاتێکیش کەسێک دەیویست دەست بەرێت و بیانچنێتەوە لە ترساندا نوقم دەبوون. هەنگاوی نێوان دارتەلی سەر شەقامەکانیش، کە چەندان جار ژماردبوومن و هەمیشە ژمارەیان لە جارێکەوە بۆ جارێکی تر دەگۆڕدرا، بەڵام خۆ دەبوو جارێک لە جاران ڕاست دەربچن. ئا، دەبوو ئێستاکە لە منیش ڕوو بدات، یەک دوو ئێوارەش لەمەوبەر خۆم بە خۆمم وت، دەبێت ئیتر ڕوو بدات. یەکەم جار لە چێشتخانەیەک یەکترمان بینی و ئیتر لەوساوە چەند جارێک یەکترمان بینیبوو. بەڵام ئێوارەی پێشووتر پێی وتم، کە ئیتر دەبێت ڕوو بدات. ئازاریشی نایەت، بەڵام پاشان نەختێک خوێنی لێ دێت. ــ بە ڕاست! خوێنی لێ دێت! دە کەواتە، هەر چۆنێک بێت، ئازاری هەر دەبێت. هەندێک دەڵێن وەک جزوویەکە و پاشان خوێنی بەدوادا دێت. ئێ کەواتە وەکوو جزوویەک هەستیشی پێ دەکەیت و پاشان خوێنی لێ دێت، دە مادام وایە ناوێرم خۆم لە قەرەی بدەم، بەڵام ئاخر خۆ چاوەکانیشم ناتوانن تا هەتاهەتایە وەکوو گوڵەزەنبەقی ڕەش بەو ناوەدا لەنێو ئێوارەڕووبارەکاندا مەلە بکەن و دەبێت جارێک لە جاران ژمارەی هەنگاوەکانیش ڕاست دەربچن. هەموویان، هەموویان پێیان وایە کە دەتوانن دەست بەرن و چاوەکانم بچننەوە و دەڵێن: هێندە جوانن، هێندە گەیوون، هەر

مەپرسە! بەڵام ئێستا هەر چۆنێک بوو دەبوو ڕوو بدات و ئەویش پێی وتبووم و منیش هیچ نکوڵییەکم لێی نەبوو.
ئەم ئێوارەیە، ڕوو دەدات! ئەو پێی وتبووم: لە پێشدا دەڕۆین نان دەخۆین و هەروەها شەرابیش دەخۆینەوە، ڕەنگە ئەوساش ئاسانتر بۆمان بچێتە سەر. ئەگەر دوای شەراب خواردنەوە، ئاسانتر بێت، ئەوا ئەم ئێوارەیە شەراب زۆر دەخۆمەوە، ئاخر هەر ئەم ئێوارەیەشە کە دەبێت ڕوو بدات. ئەو مەیگێڕەی خزمەتی دەکرین، وتی: کچێکی زۆر جوانە، زۆر زۆر جوانە و تۆ بڵێیت ئەمیش بە سەریدا هاتبێت. چی بە سەر هاتبێت؟ ئاوها! بێگومان! بێگومان! پێوەی دیارە! هەر بە ڕاستیش، کەواتە دوای ئەوە پێتەوە دیارە و لە خۆشم دەپرسی کە ئاخۆ دوای ئەوە چۆن دەردەکەوێت. پێدا دەچێت و پاشان خوێنی لێ دێت، تێی دەچەقێت و پاشان خوێنی لێ دێت، بەڵام ئەو وتبووی، ئەگەر شەراب بخۆیتەوە، هێندە هەستی پێ ناکەیت. بەڵام خۆ شەرابی سووریش وەکوو خوێن سوورە. ئەو میوانانەی لەم ژوورەدا لەگەڵماندان، دەتوانن بە دڵنیاییەوە ئەوە لە مندا ببینن، کە هەر ئەم ئێوارەیە لێم ڕوو دەدات، لە شەرماندا سووڕهەڵگەڕان لەنێو جلەکانمەوە دەدروشێتەوە، پێدا دەچێت و پاشان خوێنی لێ دێت، تێی دەچەقێت و پاشان خوێنی لێ دێت، بەڵام ئێستا ئیتر چاوەکانم بوونەتەوە بە گوڵەزەنبەقی ڕەش، بەنێو ژوورەکەدا دەگەڕێن، لە بەردەم وێنەی ژنێکی ڕووتدا، کە قژی دادەهێنێت، دەوەستن و بە گەڵاکانی خۆیان سنگی دادەپۆشن و ئەوجا دەگەڕێن و دەچن بەسەر ئۆرکێستراکەوە، کە سوور دەچێتەوە، دەنیشنەوە، هەموو شتێک لەم ژوورەدا سوور دەچێتەوە، بەڵام لە هەمووان سوورتر کەمانەکەیە، کە چاوەکانم لەناویدا ون دەبن.

***زەحمەت نەبێت، هەقەکەمان؟*** هەر وا زوو؟ بە ئاگا دێمەوە و چاوەکانم بە خێرایی دەگەڕێنەوە بۆ لای ترسەکەی خۆیان، پێدا دەچێت و پاشان خوێنی لێ دێت، پێدا دەچێت و پاشان خوێنی لێ دێت. تەکسی بگرین؟ ئەی لەوە، سواری ئۆتۆمۆبیل دەبین، نەک ترام! کەواتە هێندە ناخایەنێت ڕوو دەدات، چونکە بە ئۆتۆمۆبیل زۆر خێرا دەگەیتەوە ماڵەوە.

ئۆتۆمۆبیلەکە بەنێو ئێوارەڕووبارەکاندا: چزوو، خوێن، خوێن، چزوو، بەڵام هێندە نابات و هەموو شتێک کۆتایی دێت. ئەو زۆر جاران لێ دەپرسیم بۆچی مەمکەکانم دەشاردەوە، بەڵام من هەمیشە ڕقم لە خرتی و دەرپەڕینیان دەبووەوە. ئەو پێی وتبووم کە ئازاری نایەت و دوای ئەوەش هەست بە خۆشییەکی زۆر دەکەیت و ئاساییشە کە ئەوە هەر دەبێت ڕوو بدات، ئەگەرنا پیاوان پێت پێ دەکەنن. بەڵام من ئێستا ئەوە لێی ڕوو دەدام و هەر لەم ئێوارەیەش درەنگتر نەبوو، کە ڕووی دەدا. وا ئۆتۆمۆبیلەکە وەستا. پلیکانەکان نابڕێنەوە: چزوو، خوێن، خوێن، چزوو، کلیلی ناو قفڵەکە، دەرگاکە لە دوامانەوە دادەخرێتەوە، چاوەڕوانیی بێدەنگی ژوورەکە.

پێیدا دەچێت و پاشان خوێنی لێ دێت، پێیدا دەچێت و پاشان خوێنی لێ دێت. ڕووتوقووت لە تەنیشت یەکترەوە پاڵ دەکەوین، دەستەکانی، دەستە ساردە تەڕەکانی، بە لەشمدا دەگەڕێن، دەمەوێت ماچی بکەم، بەڵام ئەو ڕوو وەر دەگێڕێت، خۆی دەخاتە سەرم، سەیری دەموچاوە ئارەقاوییەکەی دەکەم، سەیری لێوەکانی دەکەم کە دەمەوێت گازیان لێ بگرن، چزوو، خوێن، ئێستا شتێکی نامۆ بە لەشمدا دەچێت، بەڵام خۆ دەبێت لە پێشدا وەکوو چزوویەک تێی هەڵچەقێت و ئەوجا ــ

ئەو دەڵێت: نەختێک زیاتر قاچت بڵاو بکەرەوە! بەڵام من ناوێرم، چاوەکانم پەنا بۆ پارێزی گوڵەزەنبەقەکان دەبەنەوە. ئەو دووبارەی دەکاتەوە: نەختێک زیاتر قاچت بڵاو بکەرەوە! شتێک لەناومدا بەرهەڵستی دەکات، پڕ بووم لە ترس، چزوو، خوێن، ئەو هەوڵ دەدات و منیش بەرهەڵستی دەکەم. ئەو دەڵێت: با پشوویەک بدەین! ئەوجا هەوڵ دەدەینەوە! ئاوها! جارێکی تریش هەوڵ دەدەین، چزوو، خوێن. ئەو دەچرپێنێت بە گوێمدا: هەر نەختێکی ماوە! لێی دەپرسم: ئەوانی تر قیژاندیان؟ کامانەی تر؟ ـ ئەو ژنانەی تر کە وات لەگەڵدا کردوون. ـ ئەو ژنانەی تر کە وام لەگەڵدا کردوون! ئا... هەندێکیان قیژاندیان. ئاها، ئەوان لە پاشاندا قیژاندیان، چزوو، خوێن و پاشان قیژاندن. ئەو دەڵێت: دەی با خەریک بینەوە!، بەڵام من لە ترساندا داخراوم و ناکرێمەوە، ـ چزوو، خوێن، قیژە، چۆن ئەوانی تر زاتیان کردووە و ئەمەیان کردووە، ماندووم، لە پەلوپۆ کەوتووم و دەمەوێت بە خەوێک هەموو شتێک لە بیر خۆم بەرمەوە.

***کــە ڕامــدەکــرد بۆ ئەوەی بیــبــینم***، هەم نیگەرانی و هەم بەختەوەریش لە هەنگاوەکانمدا هەبوون. چاوەکانم، بەسەر بەردە زەرد و بۆزەکانی شەقامەکەدا، وەکوو پەپوولە باڵەفڕێیان بوو، ئۆتۆموبیلەکان بە لامدا گیڤەیان دەکرد و تێدەپەڕین و تەنوورەکەمیان پڕ دەکرد لە با. مەمکەکانم وەکوو دوو چیای بەر خۆرەتاو دەگڕان، ڕانەکانم وەکوو قاقڵەی لمین قورس و گران بوون، بەڵام وەکوو شارەمێرووولەی بەر گەرمای هاوینانیش پڕ لە ژیان و جموجووڵ بوون، نێوڕانیشم وەکوو کاڵەکێکی گەیوو، تەڕوبڕ بوو.

کە چاوم بە ئۆتۆموبیلەکەی کەوت، هەزاران زەنگۆڵەی بچووک بچووک لەنێو ئەندامەکانی لەشمدا کەوتنە چکەچک، لێوەکانم لە یەکتری جیا بوونەوە، هەستم کرد کە لێوی ژێرەوەم، وەکوو دڵۆپەئاوێکی پڕ لە هەنگوین قورس بووە، لەپی دەستەکانم پڕ بوون لە ئاونگەئەستێرەی بچووک بچووک و کونەلووتەکانیشم وەکوو باڵی پەپوولە دەلەرینەوە.

بەڵام کاتێک کە ئۆتۆموبیلەکە لە بەردەممدا ڕاوەستا، نیگەرانی بەسەرمدا زاڵ بوو و گشت زەنگۆڵەکانیش لە چکەچک و لێدانی خۆیان کەوتن، پەپوولەی ناو چاوەکانیشم باڵیان لێک نا و خۆی کرد بەنێو گوڵەکانی نێو تەنوورەکەمدا، لێوەکانم بە یەکتر گەیشتنەوە و بە وریاییەوە بە دەوری حەز و تاسەی ددانەکانمدا داخران و ڕەنگزەرد وەکوو پەیکەرێک لە مەڕمەڕ خۆم بە ئۆتۆموبیلەکەیدا کرد. لەوێدا، لە ترسی دەستەکانی، لە پەلوپۆکەوتوو، دانیشتم؛ بەڵام هاوکاتیش پڕ بووم لە حەز و تاسەی ئەوەی کە ئاگرەکەی ناخمی بەسەردا بپرژێنم.

دەمهێنایە پێش چاوی خۆشم کە چاوەکانی، دەموچاوی و

هەموو ئەندامەکانی لەشی، کاتێک کە بۆ بینینی من سواری ئۆتۆموبیلەکەی بووبوو، پڕ بوون لە پێکەنین. ئۆتۆموبیلەکەی: لەیستۆکە تازەکەی! بە خۆشییەوە پێدەکەنی، پێکەنینی نەرمونیان، پێکەنینی گەرم، پێکەنین هەر بۆ پێکەنین و بیری لە بەژنوبالاَ شلومل و نەگەیووەکەم دەکردەوە کە هێشتا شێوەی لەشی ئافرەتێکی قەیرە و پێگەیووی نەگرتبوو، بیری لە بەرهەڵستکارییە منداڵکارانەکەم، لە ترس و سڵەمینەوەم، لە حەزوتاسەم کە لەپڕێکدا دەیتوانی دەریاچە ڕەشەکەی خۆی بکاتەوە و بە قووڵاییەکەی بیترسێنێت، بیری لە تووڕەبوونم دەکردەوە کاتێک دەستی دەبرد و بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بەنێو شوێنە نهێنییەکانی لەشمدا دەگەڕا و کە بیریشی لە دەستە بچکۆلە داخراوەکانم دەکردەوە کە وەک داری تەپڵ دەیانکێشا بە شانوملیدا، پێدەکەنی، بە گریان و شەڕی بێمانای خۆم لەگەڵ خۆمدا، پێدەکەنی.

بەوپەڕی کەیف و خۆشییەوە، کاتێک کە لەشولارە کاڵەکەمی بینی وەکوو ڕووناکییەک لەنێو زەردەپەڕی ئێوارەدا پرتەپرتێتی، پێکەنی. کە دەستیشی بە هۆڕنەکەدا نا، داچڵەکیم و لە جێی خۆم سڕ بووم و وەکوو کاراسکێکی ڕاونراو گوێم ڕادێرا، ئای! ئەو دەیزانی، بەتەواویش هەستی بەوە کردبوو کە چی لە ناخ و دەروونمدا دەگەڕێت. من ئیتر وەکوو بەچکەمەلێک بووم کە زاتی ئەوەی کردبوو بەرەو بەرزایی ئاسمان بفڕێت و ئێستاش لە ترسی بەربوونەوە هەموو گیانی کەوتبووە حەشۆکە و لەرزین. من لە زەبر و بەهێزیی ژیان دەترسام. ئێستا ئیتر ئەو ئۆتۆموبیلەکەی ڕاگرت و بە تیلەی چاوە شینە پێکەنیناوییەکانی سەیری کردم.

بۆ ماوەیەک دەستی بۆ نەبردم. دانیشتبووین و پێدەکەنین و بە زایەڵەی وشەکانیش بەرانبەرێنمان لەگەڵ یەکتردا دەکرد. دەستی لە ڕامووسانم هەڵگرتبوو و چاوەڕێی ئەوە بوو لەشم بە بێئاگاییەوە، وەکوو ئەوەی داوای ڕامووسان بکات، بەرەو لای ئەو بچەمێتەوە. ئەوسا دەستی کرد بە ماچکردنم، خۆشلکردن و خۆبەدەستدانە شینەکەی لە ئامێز گرتم، تاسەوحەزە نەرمونیانەکەی هەڵمژیم. بەڵام هەر ئەوەندەی زمانی خستە ناو دەممەوە، بە ترسەوە خۆم ڕاپسکاند و وەکوو گوڵێکی تەزیوو لە جێی خۆمدا ڕەق بووم.

هەر ئەو گوڵە تەزیووەش بوو ئەوی گەرم کرد و زریانەکەی، زریانە ناوەختەکەی خۆی، بەسەردا ڕژاندم. هێشتا فریای ئەوە نەکەوتبووم کە لەگەڵ دەستلێدانی شوێنێکی لەشمدا ڕابێم، دەستی بۆ شوێنێکی تری لەشم دەبرد و منیش دەبوو لەگەڵ ئەوەدا کە هێشتا پێی ئاشنا نەبووبووم بکەومە بەرهەڵستی و بەگژداچوونەوە. ئەو بە قووڵی زمانی لە تەنگەبەریی ددانەکانم هەڵچەقاند و دەستە پەرۆشەکانیشی لەنێو مەمکەکانمدا، لەنێو ڕانەکانمدا، دەگیرا؛ بەڵام هیچ شوێنێکی لەشم وەڵامی حەز و ئارەزووەکانی ئەوی نەدەدایەوە، ئەو تەنیا پەشیمانی لە ناخمدا بە ئاگا هێنابووەوە و ترسە کاڵەکەی قژیشم وەکوو لەزریانێک دەوری سەری دابووم. ئەوجا وازی لێ هێنام و بەدەم زەردە و پێکەنینەوە ئۆتۆمۆبیلەکەی خستەوە ئیش.

بەدەم گریان و لەرزەوە لە تەنیشتیەوە دانیشتم و ئەویش هیچ گوێی نەدەدا بە دڵدانەوە و ئارامکردنەوەم. حەزی لەوە بوو لەنێو زریانەکەی خۆمدا بە بەندکراوی بمبینێت، بمبینێت چۆن وەک شێتێکی بچکۆلە بەرهەڵستی دەکەم، ئاه!، ئەو

دەیتوانی هەموو شتێک لە چاوەکانمدا ببینێت: دیمەنی دەرودەشت، باڵندە ڕێهەڵەکردووەکان، ئەو شادییەی تێکوپێک شکێنرابوو و بووبوو بە سەراسیمەبوون، ئەو گوڵاڵەسوورانەی لەنێو کێڵگەیەکدا کەروێشکەیان دەکرد، دەریاچە ساردەکانی چیا، ئەو ڕۆژە باراناوییانەی لە برانەوە نایەن، کەشتییە سەهۆڵینەکان، ئەو ژنانەی لە زەردەپەڕدا خۆیان خنکاندبوو، ژنە گریاوەکان، ئەو ژنانەی پێ دەکەنین، هەموو ئەم شتانە، دەیتوانی هەموو ئەم شتانە لە چاوەکانمدا ببینێت و ئەمانەش من بووم.

پێچی بە ئۆتۆمۆبیلەکەی کردەوە و بەرەو ماڵی ئەوان گەڕاینەوە.

بە بێدەنگی لە ماڵەکەیدا ڕاوەستام. گوێ و چاوەکانیشم بە نەرمەگژوگیای ماندووبوون داپۆشرابوون، هیچم نەدەبینی، هیچم نەدەبیست، بە بێدەنگی چوومە ژوورێکەوە، کە دیوارەکانی بە گژوگیا داپۆشرابوون. لەسەر قەنەفەیەک دانیشتم و بە دەوروبەری خۆمدا دەمڕوانی و پڕ بوو لە ئەڵقەی ڕەش ڕەش. ئەو کتێبێکی دامێ، بەڵام من لەوە ماندووتر بووم بتوانم بخوێنمەوە و بۆ ئەوەی بحەسێمەوە لەسەر قووڵایی ژوورەکە لێی ڕاکشام. چاوەکانم داخستن و خوێنیش لە گوێمدا دەستی کرد بە شنەشن، بەڵام ئەوە خوێنی من نەبوو و خوێنی هەزاران ئەسپ بوو کە غاریان دەدا و سمکۆڵانیان بوو، خوێنی هەرگیز ڕانەوەستاوی بایەکان بوو کە دەیکێشا بە گوێمدا. تەماشای دەستەکانمم کرد، وەکوو ئاسنی داگیرساو وا بوون، سەیری تەنوورە چرچولۆچەکەمم کرد و بە دزییەوە دەستم خستە سەر ناوگەڵم و ئەویش وەکوو ئەستێرەیەکی تازە بەربووەوە دەگڕا و دەموچاوم لەنێو دەستەکانمدا شاردەوە و ئاوێکی هێمن و

ئارامم بینی کە لە بنیدا هەزاران ئەستێرە نووستبوون، پیاوێکی سپیپۆشم بینی کە لەبن دارسێوێکی پڕ لە گوڵدا خەریکی پشوودان بوو، خۆمم بینی لەبەر دەرگای کایەنێکدا دانیشتبووم و گوڵەبەیبوونێکم هەڵدەمژی.

بەدەم ئەو پرسیارەوە کە ئایا هیچ تەماشای کتێبەکەم کردووە، بێدار بوومەوە. پاشان ئەو ڕۆیشت و منیش لەنێو گژوگیای پشوودانەکەمەوە هەڵسام و دەستم کرد بە هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی کتێبەکە. چەند وێنەیەک لە کتێبەکەوە بەر بوونەوە، هەڵمگرتنەوە و تەماشام کردن. بە پەلە خستمنە لایەکەوە و بەڵام هیچم نەوت، ئاه! بیرم کردەوە، دەبێت ئەو ئێستا لە ژوورەکەدا بێت و بەدەم جووڵەی بەپەلەی پەشیمانییەوە ڕووی خۆم وەرگێڕا و ئەو لە پشتی پەردەیەکەوە ڕاوەستابوو و پێدەکەنی. وا پێدەچوو پێکەنینەکەی بڵێت: هەها! حەزت لە وێنەکان نەبوو! تووڕەیی لە ناخمدا دەستی کرد بە کەفوکوڵ، دەستم دایە کتێبەکە و گرتمە سەروچاوی، هەموو وێنەکان بەر بوونەوە، بەڵام ئەو تەنیا هەر پێدەکەنی و پێدەکەنی و پێکەنینی بەسەردا دەباراندم. بە هەموو هێز و توانامەوە بەرهەڵستیم کرد، دەموچاویم بە نوقورچ ڕووشاند، ئەویش لێی دام، من گریام، ئەو پێکەنی، من پاڕامەوە و ئەویش تەنوورەکەی خوێناوی کردم. خۆم لە دەستی ڕاپسکاند و بەرەو دەرگاکە ڕامکرد، بەڵام ئەو پێمگەیشتەوە و پڕی کرد بە قژمدا، من بە تەواوی تۆقیبووم و بە هەموو توانامەوە هەوڵم دەدا خۆم لە دەستی ڕزگار بکەم. کاتێک کە لە پشتمەوە دەرگاکە بە یەکدا درایەوە، ئەو بەدەم پێکەنینەوە ڕاوەستابوو و چنگیشی پڕ بووبوو لە قژم. لەشم پڕ بووبوو لە بەرد، بەردی قورس و بێدەنگ و بە شەلەشەل بە پلیکانەکاندا هاتمە خوارەوە.

***كە دەرگای ماڵەکەی کردەوە پێی وتم:*** شەممە، یەکشەممە، دووشەممە! و دووشەممە تۆ ئیتر ژنیت!

منش سەری ڕەزامەندیم بۆ لەقاند: دەبێت منیش، جارێک لە جاران، سەرکەوتن بەسەر ئەو شتەدا کە لێی دەترسێم بە دەست بهێنم، ئەو شتەی کە دەمێکە لێی ڕادەکەم، ئەو شتەی زۆر بە تاسە و ئارەزووییەوە بووم.

شەممە درێژترین ڕۆژی هەفتەیە، چونکە یەکشەممەی بەدوادا دێت، یەکشەممەی بێهۆشیش کە بە هیچ کاروبارێکەوە سەرگەرم نییە، کورتترین ڕۆژی هەفتەیە، چونکە باری گرانی دووشەممەی بە دوادا دێت. بەدەم ئەم قسانەوە، لە کاتێکدا کە هێشتا ڕۆژی ڕووناک بوو، پەردەی بە ڕووی شەممەدا دادایەوە و ژوورەکە بوو بە شەوەزەنگ.

بەڵام کاتێک کە من ئیتر ئەوەم بەسەرهاتبوو کە هێندە لێی دەترسام، ئەوەی کە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لە دەستی هەڵاتبووم، ئەوەی کە ماوەیەکی دوورودرێژ بە تاسە و ئارەزووییەوە بووم و هەر بۆشاییەکی گەورە لە دەوروبەرمدا مابووەوە، ئیتر هەر بێدەنگییەکی لە پەلوپۆکەوتوو لە ناخمدا شنەشنی بوو.

نەمدەتوانی خەون و ڕاستی لە یەکتر جیا بکەمەوە.

پێم وا بوو کەوتوومەتە نێو بیابانێکەوە و باڵندە بێدەنگەکانیش لە دەوروپشتم کۆ بوونەتەوە و بە چاوە سوورەکانیان سەیرم دەکەن و بارانیش بەسەر باڵە وەکوو مێتاڵ شینەکانیانەوە دەبریسکێتەوە.

لە تەنیشت بیرەکانیشەوە ژنەکان ڕاوەستاون و لەبەرخۆیانەوە گۆرانییە خەمهێنەرەکانیان دەچڕن و بە گۆزەی گەورە ئاو هەڵدەکێشن و دەیکەنەوە بیرەکانەوە و

گۆرانییەکانیشیان لە دووری دوورەوە، لەنێو نادیاریدا، پێچ دەخۆن و دەکشێن.

قووڵایی ئاسمانیش لە قووڵترین قووڵایی قووڵترە، ئەو قووڵاییەی کە قەت جارێک لە جاران نە بەرەوخوار و نە سەرەوژوور پێمدا نەڕوانیوە.

دەریاش بووبوو بە ملیۆنان شەپۆلی گورجوگۆڵ و بەدەم یاریکردنەوە وەکوو بەچکەپشیلە بە دەوری یەکتردا دەهاتن و دەچوون.

بیرم کردەوە، دەریا هەر دەتوانێت خۆی خۆش بووێت، بەڵام لە هەمان کاتیشدا لە خۆم دەپرسی ئەو منداڵە بچکۆلەیەی کە بەر لە هەزاران ساڵ لەنێو قامیشەڵانە سەوزەکەدا دۆزیانەوە و هەمیشەش هەزاران ساڵ دوای ئەمڕۆش هەر لەنێو هەمان قامیشەڵانی سەوزدا دەدۆزرێتەوە، چ هەستێکی هەبووە کە لە بێشکەی سەوزی قامیشەڵانیان دابڕیوە و بەرەو ڕووناکیی تیژی ژیان هەڵیانگرتووە.

خەون یان ڕاستی، هەموو یەکشەممەکان کۆتاییان دێت، تەنانەت یەکشەممە سوورەکانیش!

ئەوجا بەیانی برینەخۆری خۆی کردەوە.

کەواتە ئەمە بوو لێی ترسابووم، لێی هەڵاتبووم و هاوکاتیش بە حەز و تاسەوە بووم بۆی!

پێکەنینی باڵندەکە بێکۆتایی بوو.

خەون نەیدەویست بە جێم بهێڵێت.

پیاوەکان بەنێو ئەو خاکە تازەکێڵراوەدا دەڕۆیشتن و تۆوپرژێنیان دەکرد، ئەو تۆوەی ئەوانیش دەیانپرژاند، نەوڕەسە برسییەکان دەیانچنینەوە.

یەکێک لە پیاوەکان دەستێکی هەبوو کە پەنجەکانی وەکوو

دەمـــەچەقـــۆ تیـــژ بـوون و هـەر بەو دەســـتـەش ســـەری هـەمـــوو گولاڵەسوورەکانی بڕی.

کەواتە چیتر من خۆم نیم، بیرم کردەوە، بەڵام من ژنم!

پڕ بە دڵ تاســە و ئارەزووی ئـەوەم دەکـرد، کـەســێک دەمم دابخات، ئەو دەمەی دەیویست بقیژێنێت و بقیژێنێت.

نا، ئەوە من نەبووم کە ئەو بەیانیی دووشـەممـەیە خـەبەری بووەوە.

ئەوە کاراسکێک بوو، کە لە باخێکی هەڵەدا بەندکرابوو.

ئەوە گولاڵەسوورەیەک بوو، کە ملی پەڕێنرابوو.

ئەوە ئەو منداڵە بوو کە هەزاران ساڵ لەمەوبەر لە بێشکەی قامیشەلانە سەوزەکەوە بەرەو ڕووناکیی بەشەوارەخەری ژیان هەڵگیرا.

کە بە خۆم و بەتاڵیی دووشـەممەکەمـەوە بە پلیکانەکـاندا هاتمە خـــوارەوە، زانیم کـــە زۆر دەخـــایەنێت تا بـەشــــداریی شەممە، یەکشەممە، دووشەممە!یەکی دیکە دەبمەوە.

ئاه! ئەگـەر ئێـوەش بەشــداری ئەو بەیانـیـیـە ناخـۆشـانە دەبوون!

من تەنیا یەک مانگ بەرگەم گرت!

دەبوو ئێـوەش لەگـەڵ منـدا بەنێـو ئەو شـارە پڕ ڕەشـەبا و ســاردوســڕەدا، پاشــانیش بەنێـو هـۆڵی ئەو کـارگـانەدا کـە گۆشتیان لێ کوت کوت دەکرا و بۆنـی خـوێنیان لێ دەهات، بگەڕانایە، تا ئـاخرییەکەی بە دۆزەخی پڕ لە دەنگەدەنگی ئەو نووسینگەیە بگەیشتنایە کە بە ژماردنەوە سەرگەرم بوون.

چ بەیانیانێک بوون، ئەو بەیانییانە!

شەقامەکان تاکە تاکە نەبێت کەسێکیان پێوە نەبوو. بەفر لـە ســـەرمـــاندا شـین و ســـپـی دەچووەوە. چاوی هـەمـــوو پەنجەرەکان بە گوڵی سەهۆڵین کوێر بووبوونەوە.

بەڵام ڕمی هەڕەشەکەری چلوورەکان، زۆر چڵێسانە و بە هەڕەشە و تووڕەییەوە، بە گوێسوانەکانەوە شۆڕ بووبوونەوە.
بایەکانیش! ئەوانیش دەژیان و بەدەم سەرکەوتنەوە بەنێو بیابانی شەقامەکاندا سەمایان دەکرد، لەوحەی ژەنگاویی هەڵواسراوی سەر دەرگای دوکانەکانیان ڕادەوەشاند و ژیانێکی پڕ لە زرنگەزرنگیان بەو ناوە دەبەخشی. بە دەمیان گازیان دەگرت و ساردوسەرمای تیژی وەکوو چەقۆی خۆیان دەکرد بە سەری لووت و نەرمەی گوێ و ڕوومەتەکانمدا و لەسەر هەر سووچێکیش خۆیان بۆ چەند بایەک دابەش دەکرد و جلەکانیان لە بەردا ڕادەکێشام و دەیاندراندن و بە پەرۆشەوە پڕیان بە چمکی بەدەم باوە شەکاوەی پاڵتۆکەمدا دەکرد، وەک ئەوەی بیانەوێت یاری لەگەڵ چارۆکەیەکدا بکەن.
منیش بەدەم وردەلەرزەوە پاڵتۆکەم لە خۆمەوە دەپێچا، بۆ ئەوەی چیتر تەنانەت بایەکی بچووکیش نەتوانێت پڕ بە چمکێکیدا بکات.
ئای چەندە سەرمام بوو و چۆنیش هەوڵم دەدا لەبەر هەڵمەتی بایەکاندا خۆ ڕابگرم! چاوەکان فرمێسکی سەهۆڵینیان دەگریاند. دەمم داخراو و گرژومۆن و دەستەکانیشم بەدەم سووکایەتیپێکردنەوە خۆیان لەنێو دەستکێشەکانمدا گرمۆڵە کردبوو.
ئەوجا نۆرەی ئەو ڕاڕەوە دەهات کە لە پڕێکدا لەبەر دەممدا قوت دەبووە و شەقامە ڕەنگی مردوو لێنیشتووەکانی بەو هۆڵانە دەگەیاند کە گۆشتیان لێ چاک دەکرا و بڵێسەیەکی سووریان لێوە بەرز دەبووە.
ئای لەو بەیانییانە!
بۆنێکی گەرم و شیرینی گۆشت و خوێن خۆی دەدا بە ڕوومدا و بەنجی دەکردم.

یەک لە دوای یەک عەرەبانە پڕ لە گۆشتەکان کە هێشتا هەڵاویان لێ هەڵدەستا بە دوای یەکتردا ڕاپێچ دەکران. دەنگی گڕی پیاوانیش فەرمانی دابەشکردنی گۆشتیان دەقیژاند و دەنگی زیقاوڵەی ژنانیش وەڵامیان دەدانەوە.

لاشە تازەسەربڕاوەکان دادەگیران، لەتوپەت دەکران، بار دەکران و دەبردران.

پارچەگۆشتی کڵپەکردوو و هەڵواسراو لە هەموو لایەکەوە بە قولاپە ئاسنینەکانەوە، لاشەی سپی و چڵکنی بەرازەکان هەڵواسرابوون و دەسووڕانەوە و تاڵ تاڵ خوێنی ڕەقهەڵاتووشیان پێدا دەهاتە خوارەوە: بینیم کە چۆن چاوەکانیان لە هەموو بینینێک پاک بووبوونەوە.

سەری بڕاوی گوێرەکەکان لەنێو تەشتی گەورە گەورەدا خوێن دەگریان: چاوەکانیان هێشتا خەونی نێو مێرگەکانیان تێدا مابوو.

ئەو ورگ و ڕیخۆڵانەی تازە دەرهێنرابوون، هاڵاویان لێ هەڵدەستا و تەپۆڵکەیەکیان لە ماری سەوز، ڕەش، زەرد و شینی سووربای پڕ لە بریقوباق دروست کردبوو.

پیاوەکان قۆڵە تووکنەکانیان لە تەشتی پڕ لە خوێن دەردەهێنا و لەگەڵ ڕەوەشاندنی دەستیاندا گوڵەخوێنیان بە دەوروبەری خۆیاندا بڵاو دەکردەوە، پێدەکەنین، دەستەکانیان بەو خاولییانە وشک دەکردەوە کە لە خوێن هەڵکێشرابوون.

تەنانەت فەرشی بێدەنگی ئاردەدارپێوەکراوی ئەرزەکەش پڕبوو لە خوێن.

بۆنی گۆشت و خوێن! هاتوهاوار بە دوای گۆشتی زیاتر و خوێنی زیاتردا! هەموو ئەمانە دڵیان تێکەڵ دەهێنام و بەڵام ناچاریش بووم، بۆ ئەوەی بگەمە نووسینگەکە، دەبوو بەنێو

ئەم ڕاستەڕێیەدا بڕۆم کە بە پارچەگۆشتی کلێپەکردوو و لاشەی گیانلەبەرە هەڵواسراوەکان دەورە درابوو، دەبوو بەنێو ئەو پیاوانەدا بڕۆم کە پێدەکەنین و دەستە خوێناوییەکانی خۆیان هەڵدەگلۆفت.

ئەوجا دەشمبینی کە ئەوانیش ئەوە دەبینن کە چۆن بێزم لەو هەموو شتە دەبێتەوە و لێی دەترسێم.

بینیشم کە چۆن کەیفیان بە حاڵی من دەهات، چونکە کاتێک کە زاتم دەنایە بەر خۆم و بەنێو ڕاڕەوەکەدا دەڕۆیشتم، پاڵیان بە کەلاشەکانەوە دەنا بۆ ئەوەی بە هەڕەشەوە بەرەو لای من بسووڕێنەوە. منیش دەبوو بە تەواوی خۆم بچەمێنمەوە، نەبا کەلاشی بەرازێک بەر ڕوومەتم بکەوێت و، تا قووڵایی نووسینگەکە و دۆزەخی تەقەتەقی ژمارەکانیش پێکەنینە ناقۆڵاکەیان هەر بە دوامەوە بوو.

ئای لەو بەیانییانە!

مەکینە و مەکینە لە هەموو جێیەک!

مەکینەی ژماردن، گەورە و بچووک. مەکینەی نووسین بە ڕیز دانراو. مەکینەی کونکردن. مەکینە بۆ دادانی قەڵەمەکان.

ئەو هەموو مەکینانەی چکەچکیان بوو و پێشبڕکێیان لەگەڵ ئەو تەلەفۆن و دەنگانەدا دەکرد کە نەدەبڕانەوە و هاواریان دەکرد: دە کیلۆ گۆشت! دە لیتر خوێن! و تەلەفۆنەکان بە یەکدا دەدران و دادەخرانەوە و زەنگ لە دوای زەنگ بە دوای یەکتردا دەهاتن.

دەستە چوست و چالاکەکان بەسەر مەکینەی نووسینەکاندا دەهاتن و دەچوون. دەستە چوست و چالاکەکان بە مەکینەی ژماردنەکانیاندا دەکێشا و مارەکاغەزینەی سپیش کە بە ژمارەکان داپۆشرابوون بەسەر

ئەرزەکــەدا لوول دەبـوون و پێـچـیــان دەخــوارد. کـە دەسـکی مـەکینەی ژمـاردنەکان و مـەکینەی قەڵەمـدادانەکانیان با دەدا دەنگێکی زیقنیـان لێ بـەرز دەبووە کـە بۆ مـاوەیەک لە گـوێدا دەزرنگـانەوە، بەڵام دەنگی ئەو مــەکـینانەی کـونیـان دەکـرد هێندە نەدەزرنگانەوە و هەر چکەچکێکیان دەکرد و دوایی دوو کونی ڕەش سەیریان دەکردن.

ئێمە سیوپێنج کەس بووین کە بە مەکینەکانماندا دەکێشا و لە ڕیزێکی دوورودرێژدا، وەکوو ڕەحلەکانی قـوتابخـانەیەک، دانیـشـتـبـووین و هـەمـوو ڕوومـان لە بـەڕێوەبەرەکـە بوو، کـە وەکـوو دیکتــاتۆرێک فــەرمـانـڕەوایی دەکـرد و بـەسـەرمــاندا دەینـەڕاند و دەیقــریشکاند و جـوێـنی وای پێ دەدایـن کــە بە باشی لێیـان تێ نەدەگەیشتین، بەڵام بەشی ئەوەیان دەکرد کە سەرورووومان سوور هەڵبگەڕێن. دەرگاکان دەکرانەوە، دەدران بە یەکدا و بۆنی گۆشت و خـوێنیش وەکوو بایەکی شیـرین بە پێدزکـە خۆی بە ژووردا دەکرد و کرێکارەکانیش بە بەرکۆشی خوێناوی و نیگا ناقۆڵاکانیانەوە خۆیان بە ژووردا دەکرد.

منیش بە درێژایی کات لەنێو دەفتـەرێکی گەورەدا، بەدەم لێدانی تـەلەفۆنەکـان و لاپەڕە لـە دوای لاپەڕە، دەمنووسـی: دە کیلۆ گۆشت، دە لیتر خـوێن و چکەچکی مەکینەکانیش هـەر لە کــاردا بوون و کــاغـەزەکــانیش ئـەرزەکـەیان داپۆشــیـبــوو و بەڕێوەبەرەکەشـمـان دەینەڕاند: ئاژاوە و هـەرایەکی بێبـڕانەوە و کۆتایی بوو.

ئای لەو بەیانییانە!

بینیشم کە چۆن ئەو کچـە خەونـی دەبینی، ئەو کچـەی زۆر جاران باسی ئەو درەختە سەوزانەی بۆ دەکردم کە بەدەم خەم و ئازارەکـانیـەوە پاڵی پێوە دەدان، ئەو کـچـەی کـە باسی ئەو

ئەسپانەی بۆ دەکردم کە لە سمکۆڵاندا بوون و ئەمیش بەسەر پشتیانەوە بوو بۆ ئەوەی لە دەست هەموو شتێک هەڵبێت، بەند کرا و لە جێی خۆیدا مایەوە.

بەڵام من، من لە دەست ئەم شتانە هەڵهاتم و ڕامکرد!

***(مودی)*** به هەڵەدا چووبوو کە وتی گەورەبوون هیچ ئێش و ئازارێکی نییە. ئێش و ئازاری گەورەبوون زۆر بوون.

ئای لەو هەموو چاوانەی هەڵیاندەمژیت و جێسووتانی هەڵمژینی خۆیان لە دوای خۆیان بە جێ دەهێشت. ئەو هەموو پێکەنینانەی ڕووتوقووتیان دەکردیتەوە، ئەو پێکەنینانەی لە دەموچاوە تووکن و دەمە پڕ لە لیکەکانەوە دەهاتن. ئەو هەموو دەستانەی پڕیان پێدا دەکردیت، بەندیان دەکردیت و بە جێیان دەهێشتیت. ئەو هەموو ماڵە بچکۆلە ئارامانەی گەورە دەبوون و دەبوون بەو خانووە پڕ لە هەڕەشانەی سەریان لە هەوران دەسوو. ئەو هەموو ئێوارە سوورانەی دەژیانەوە و مەحاڵ بوو تینوویێتییان بشکێنرێت. ئەو هەموو فرمێسک و دەستانەی ئاسمانەکانی خۆیان لە یەکترەوە ئالاند و بە دەوری یەکتردا لوولیان خوارد. ئەو هەموو ڕێگا ئاوەلانەی کە لە پڕێکدا و بێ هیچ ڕاڤەکردنێک دەبوون بە ڕێگا هەرە ترسناکەکان. ئەو هەموو ڕۆژە ڕووتوقووتانەی بەرەو ئاسمان هەڵدەکشان و درێژ دەبوون، بەبێ ئەوەی ئاسمانێکیان هەبێت لە خۆیانەوەی بپێچن.

ئەو هەموو سەوز و سوورییە، بەلام لە پشتەوەیانەوە هەمیشە ئاوێنەیەکی ڕەش. ئەو هەموو پرسوڕایە و بەلام هەمیشەش نوختەی ڕەشی "نەکەیت!" بە دوایاندا. ئەو هەموو هاوارە، ئەو هەموو باڵندەیە، ئەو هەموو گوللەیە و ئەو هەموو باڵندە کوژراوانە! ئەو هەموو تەونەجاڵجاڵۆکە ناسکانەی بە دەستی سپیی ژنان دەهۆنرانەوە، بەلام چ قریشکوهوڕێکی ترسناکیان پێوە نەنووسا!

ئای، لەو هەموو دەموچاوانەی لە پشت پەردەی درەختەکانەوە شاردرابوونەوە، ئەو هەموو ماسییە

خوێناوییانەی بە دەزووە زیوینەکانەوە خۆیان پێشان دەدا و ئەو هەمـــوو کـــەســـانەی بووبوون بە ژێر قـــورســـایی ئەو پرسیارانەوە کە وەڵام نەدەدرانەوە.

ئەگەر گەورەبوون بۆ من هێندە ئێش و ئازاری هەبووبێت، بۆ (مـــــــوددی)ش هەروا بوو. ئەو زۆر لەوە دەترســـــــا خۆشەویستیی منی لە کیس بچێت. خۆیشی و منیشی بەدەم غیرەیەکەوە دەتلاندەوە، کە تا دەهات خۆی لە دەربڕینێکی ترسناکدا پێشان دەدا و وای لێ کردم کە لە هەموو کاتێک زیاتر لە ماڵەوە نارەحەت بم.

بەیانییــیــەکـیــان بەدەم ورتەورتی (مــوددی)یەوە، کــە لە بەردەمی پەنجەرەی بەیانیی زوودا ڕاوەستابوو و خــەریکی ئاودانی گــوڵەکــان بوو، خــەبەرم بووەوە و گــۆرانی دەوت: قەحبە، قەحبە، تۆ قەحبەیەکی ڕاستەقینەی! کە بەدەم نارەزاییدەربڕینەوە لە جێگاکەمدا ڕووم لێ وەرگێڕا، بە هەڵەداوان خـــۆی بە ژوورەکـــەمـــدا کـــرد و زرم پەردەکـــەی هەڵدایەوە و کتێب و شتی دیکەی تێ گرتم و هاواری کرد: قەحبە! قەحبە! تۆ قەحبەیەکی ڕاستەقینەی، کتومت وەکوو دایکە قــەحــبــەکــەت! منیش تا توانیم بە دەســتــەکــانم خۆم پاراست و کاتێک کە ئاخرییەکەی هێندە ماندوو بوو و لەپاڵ جێگاکەمەوە کەوتە سەر چۆک و دەستی بە گریان کرد، دڵم دایەوە و گفتی ئەوەشم پێدا کە چیتر ئەو پیاوە نەبینم کە ماوەیەک لەوەوپێش بە تەواوی بە خۆیەوە خەریکی کردبووم. ئەو بیستبووی کە ئەو پیاوە ناووناوبانگێکی خراپی هەیە. پاشان بەدەم پێکەنینەوە کتێبەکانمان هەڵگرتەوە و ئەویش قاوەی بەیانی کوڵاند و هێندەی نەبرد وەکوو دوو دەستەخوشک لە دەوری یەکتر دانیشتین و دڵمان چووە سەر یەک.

بەڵام ئێستا ئیتر (موددی) بە تەواوی خستبوومیە ژێر چاودێرییەوە و هەمیشە چاو لەدوی ئەوە بوو لە کوێم و خەریکی چیم. کاتێک کە بەرەو ماڵ دەگەڕامەوە، لە پڕێکدا لەسەر سووچی شەقامەکە قوت دەبووەوە و پرسیاری سەیر و لەپڕی لێ دەکردم و لە وەڵامەکانیشمی دەکۆڵییەوە. ئەگەر بۆم بگێڕایەتەوە کێم بینیوە و هەموو شتێکم بە وردی بۆ بگێڕایەتەوە، ئەوسا سووکانییم دادەهات. بەڵام ئەگەر هەستی بەوە بکردایە کە شتێکی لێ دەشارمەوە، زۆر بە خراپی غیرە دەیگرت و بە جۆرێک شێتگیر دەبوو کە دەیتوانی هەموو شانوقۆڵم بڕوشێنێت، تا خوێنیان پێدا دەهاتە خوارەوە. هەمیشەش بەوە کۆتایی پێ دەهێنا کە لە دایکمم ئاگادار بکاتەوە، کە زۆر لەوە دەترسا بە دوایدا بگەڕێم و زۆریش لەوە دەترسا وەکوو ئەوم لێ بێت.

لەسەر بینینی ئەو پیاوەی کە جێی باوەڕی ئەو نەبوو، ئەگەرچی نکۆڵیشم لێ دەکرد، بەردەوام بووم و ئەویش، ئەگەرچی بە گەرمی چاودێری دەکردم، وا خۆی پێشان دەدا کە باوەڕم پێ دەکات. ئا بەو جۆرە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ یەکترمان خستە ژێر چاودێریی یەکترەوە، جاسووسیمان بەسەر سەروسیمای یەکترەوە کرد و چاوەڕێی شێتگیری و تووڕەییەکەی ئەو بووین، کە هەردووکمان دەمانزانی کە دەبێت بقەومێت. کاتێکیش کە قەوما، لە هەموو کاتێک خراپتر قەوما: وەکوو فیشەکەشێتەیەک بە ڕوومدا هەڵشاخا و پەنجەکانی لێ بڵاو کردمەوە و قیژاندی: دەتکوژم! دەتخنکێنم! و منیش پڕم بە جانتاکەی دەستمدا کرد و بە هەڵەداوان بە پلیکانەکاندا بەرەو شەقامەکە ڕامکردە خوارەوە و ئەویش بە دوامدا بە ڕاکردن و قریشکوهوڕ و من دەستم لە

تەکسییەک ڕاگرت کە لە پەنجە چەماوەکانی و هاتوهاوارە شێتانەکەی دووری خستمەوە. ئەوە یەکەم شەو بوو، کە بۆ ماڵەوە نەگەڕامەوە.

بۆ سبەینی کە بە ڕێوە بووم بۆ نووسینگەکە، لەوە ترسام لە سووچی شەقامێکدا ڕووبەڕووی ببمەوە و لە نووسینگەکەش پێم وتن کە ڕێی نەدرێت بێتە ژوورەوە. بەڵام لە پڕێکدا لەبەر دەرگاکەدا قوت بووەوە و کە بینیمی باوەشی پێدا کردم و بەدەم لووشکەلووشک و گریانەوە لە بەردەممدا کەوتە سەر چۆک و دەپاڕایەوە کە لەگەڵیدا بچمەوە بۆ ماڵەوە. بەڵام من نە دەمویرا بۆ ماڵەوە بڕۆمەوە و نە دەشمویرا نەڕۆمەوە. بۆیە گفتم پێ دا بگەڕێمەوە. ئەوسا (موددی) خۆشترین خواردن کە حەزم لێی دەکرد بۆی ئامادە کردبووم و سفرەی ڕازاندبووەوە و نەیدەزانی چەندە چاکەی منی دەوێت، بەڵام هەردووکیشمان خۆمان لەو باسە لادا کە بیرمان لێ دەکردەوە. (موددی) لە باسکردنی ئەم شتی پڕوپووچەوە دەیگواستەوە بۆ باسی ئەوی دیکە و دەنگیشی تا دەهات زیقن و زیقنتر دەبوو. بەو دەنگەی بە ئاگا هاتمەوە و لە پڕێکدا چاوم تێ بڕی و سەیرم کرد و ئەو بە شێوەیەکی نائاسایی دەموچاوی سوور هەڵگەڕابوو و کاتێکیش کە کەوتە ناو نیگا بێدارەکانی منەوە، ئیتر دەستی لە باسکردنەی شتە پڕوپووچەکانی خۆی هەڵگرت و بە تووڕەییەوە تەماشای کردم. پاشان بە تووڕەییەوە دەموچاوی بەسەردا شۆڕ کردمەوە و ددانی لێ جیڕ کردمەوە: یەک دوو شەو لەمەوبەر بە چەقۆی نانقاشکردنەکەوە لەسەر سەرت وەستابووم و بیرم لەوە دەکردەوە کە بیکەم بە قوڕقوڕاگەتدا یان نا!

نەمویرا هیچ شتێک بڵێم، نەمویرا ئەوە پێشان بدەم کە

چەندە دەترسام. بەڵام پاشان (موددی) ون بوو و بەدەم خۆبادان و سەماکردنەوە خۆی بە موبەقەکەدا کرد و وەکوو ئەوەی هیچ شتێک ڕووی نەدابێت، بە قاوەوە خۆی کردەوە بە ژووردا. بۆ ماوەیەکی دووردرێژیش دوای ئەوە، هەموو ئێوارەیەک ملپێچێکی ئەستوورم لە ملمەوە دەپێچا.

***(موودی)*** دنیایەک خۆشەویستی پێدام، بەڵام (ی. پ. یێنسن) دڵنیایی دەوروبەری ئەو خۆشەویستییەی تێک شکاند. چەند زۆریش (موودی) خۆشەویستی پێدام، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەیتوانی قەرەبووی سالانی بێ خۆشەویستیی سەرەتای ژیانم بکاتەوە. هەمیشە وەکوو پەپوولەیەکی کوێر بە دوای گوڵی تازەدا باڵەفرێم بوو. دەبوو خۆشەویستیم هەبێت، لەم شێوە یان لەو شێوەدا. یان لە ڕێگای نەرمونیانییەوە، یان لە ڕێگای توندوتیژییەوە. تەنیا منیش بووم کە هەستم دەکرد لە دنیای یەکێکی تردا هەم یان نیم. ڕۆژانی وا هەبوون کە بەتەواوی بە ڕاکێشانی سەرنجی ئەوانی ترەوە خەریک بووم. گەورەکانم ناچار دەکرد، کە بە منەوە خەریک بن. دەست بۆ خەوشەکانم ڕاکێشران، لێدانم خوارد و زۆر بە دەگمەنیش ئافەرین کرام، بەڵام ئەمیان گرنگ نەبوو و سەرنجڕاکێشانی ئەوانی تر گرنگ بوو. هەمیشەش گەورەیەکم دەدۆزییەوە و وا بە خەیاڵی خۆمدا دەهێنا، کە باوکم یان دایکمە و خۆشەویستیی خۆمم بەسەردا دەباراند و لەگەڵ ئەوەشدا کە (موودی)م زۆر زۆر خۆش دەویست، دەمتوانی بە سەعاتان لەبەر پەنجەرەی ماڵی ئەوانی تردا بوەستم و چاوەڕێ بم تا دێنە خوارەوە و وشەیەکی خۆشم پێ دەڵێن.

ئا بەو شێوەیە لە ڕێی تافی منداڵیمەوە نەختێک خۆشەویستی لێرە و نەختێک لەوێم قەرز کردبوو و هەمیشەش کەسێک هەبوو کە دەیویست نەختێک خۆشەویستیم بە قەرز بداتێ. هەموو بەهارێکیش سەوزایی درکەکانی خۆی لە دڵم دەچەقاند و هەموو پاییزێکیش تاریکایی لە خۆیەوە دەپێچام و چاکی دەکردمەوە و وەکوو هێلکەشەیتانۆکەیەک خۆم لە ماڵەکەمدا گرمۆڵە دەکرد و تاریکاییم بە تیشکی خەونەخۆشەویستییە داگیرساوەکانم ڕووناک دەکردەوە.

***چ قەڵەمبازێک*** بوون ئەوانەی نەمدەتوانی بیاندەم، کام قەڵەمبازانە بوون!

ئەگەر ـ

هەوڵی کام قەڵەمبازانەشم نەدا! بەڵام دەستەکە، پێکەنینەکە، گوللەکە، برووسکەکە و تاریکییەکە هەمیشە ڕێیان لێ دەگرتم و منیش قەت گوڕم نەبەستەوە و ڕامنەکرد.

چ ئاوێک هەبوون نەتوانم دەسەڵاتیان بەسەردا بگرم! کامانە بوون ئەو ئەسپانەی کە نەمتوانی بەرەو زەردەپەڕە داگیرساوەکان سواریان بم! کامانە بوون ئەو باخچانەی کە نەمتوانی بیانڕوێنم! ئەگەر ئەو تەلدڕکانە نەبوونایە! ئەگەر ئەو ماسییانەی کە گوڵەخوێنیان بە دەمەوە بوو لەپاڵ کەنارەکەوە ڕیزیان نەبەستایە! ئەگەر ئەو بەژنانەی پاڵتۆی ڕەشیان پۆشیبوو، بە جموجووڵە پەیکەرئاساکەیان ڕێیان پێ نەگرتمایە! ئەوسا دەمتوانی ئەسپەکان ماڵی بکەم، دەست بەسەر ئاوەکاندا بگرم، بەری ئەو زەوییانەی بە گژوگیا داپۆشرابوون، لە ژێر شادیی بێپایانی ئاسماندا، فراوانتر بکەم!

کام باسکە نەرمونۆڵانە بوون کە نەمتوانی لە ملی ئەو کەسەی بئاڵێنم کە بە تەنیایی جێهێڵرابوو! بە چ ڕیزە ماڵێکی ئاگرین بوو کە نەمتوانی ئەو تاریکییە ڕاوبنێم کە لە خۆشەویستەکەمەوە ئالابوو! ئەگەر من زووتر و لە ژیانی پێشووترمدا بەو قووڵییە بۆ ناو بیرە بێبنەکە بەر نەبوومایەتەوە!

چەند پەیژەی لە گوریس دروستکراوم نەچنیبوو!؟ بەڵام قەت هێندەی پێویست درێژ نەدەبوون. چەند دەستی یارمەتیدەر پەیژەی لە گوریس دروستکراوی بۆ نەچنیبووم!؟

بەڵام قــەتیش هـێندەی پێــویست بەرەو قــووڵایی بۆیان شــۆڕ نەکردمەوە.

کێیـە ئەوەی هـەردوو دەستی لە دەوری نەمامەکـەم دەچەقێنێت و ڕەگەکەم بە خشتوخۆڵەوە هەڵدەکێشێت؟

ئاخـۆ دەبێت بتـوانم بە قـووڵی خـۆم بچـەمـێنمـەوە، هێندە قـووڵ کـە بگەمـە تاریکایی لـەدایکبـوون و لەوێشــەوە خـۆم بە جامـولکەی دەستــەکانم، کـە لێیـان دەتکێتـە خـوارەوە؛ بەرز بکەمـەوە، ڕەگەکەشـم بە خشـتوخۆڵی دەوروبەریەوە هەڵکێشـم و لە جێیەکی تردا بیرِوێنمەوە، تا لەنۆژەنرِا برِوێتەوە!؟

خەمینی، سروشت و دیاردەکانی، ژیانی ڕۆژانە و خۆشەویستی: خۆشەویستیی نێوان هەڵسوکەوت و بیرکردنەوە، خۆشەویستیی نێوان من و تۆ، نێوان من و خەڵکی، نێوان تۆ و خەڵکی، خۆشەویستی بۆ خۆشەویستی، خۆشەویستی بۆ ژیان و خۆشەویستی بەر لە هەر شتێک، لە بابەتە هەرە گرنگەکانی شیعر و پەخشانە هونەرییەکانی (مارییا ڤینە)ن.

نووسینە سەرەتاییەکانی مارییا، بەتایبەت پەخشانەشیعرەکانی، پڕن لەو ڕووداو و بەسەرهاتانەی دنیای منداڵێکی تەنیاجێهێڵراو پێک دەهێنن. منداڵێکی دوور لە ئامێزی گەرموگووڕی خۆشەویستی، دوور لە هەستی پڕ لە سۆزی دایک و باوک.

ئەو ڕەشبینی و بێهوودەیی و بێهیواییەی بەرهەمی زۆربەی نووسەرانی دوای جەنگی دووەمی گرتبووەوە، بە ئاسانی لە نووسینەکانی مارییادا هەستیان پێ دەکرێت.

تارمایی ئەو ترس و نیگەرانییەی بەسەر دنیای بەرهەمە ئەدەبییەکانی مارییاوە دەبینرێت، ڕووانگەیەکی تایبەتی پێ بەخشیوە و بەردەوام لەو شتانەشدا کە پاک و بێگوناه دێنە پێش چاو، مەترسییەکی گەورە ـ مەترسیی پەلاماردانی ژیان و لەنێوبردنی ـ دەبینێت.

مارییا ڤینە لە ١٩١٢/٧/٨ لە دانمارک، لە کۆپنهاگن، لە دایک بووە.

لە ساڵی ١٩٣٦دا دەبێتە ئاشنای نووسەری گەورەی سویدی؛ ئارتور لوندگڤیست و تا مردنی ئارتور پێکەوە لە پێوەندییەکی سەربەست و لە سرووتێکی ئازاددا دەژین.